



DH.MKT.00027.00003.001

| 15 شەوال 1310 | 00027.00003 | DH.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی دادی شکۆدار
جەنابی عەبدولوەهاب پاشا موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك لەگەڵ کەسێك بە ناوی ئیسلام جام قەرزاری کەسێکی ترن، بۆ ئەوەی قەرزەکە بدرێتەوە، چارەکی مووچەکەی دەبردرێت و ووردبینی کردنی لە مێژووی ٦ تشرینی یەکەم ١٣٠٨ و ٢٣ تشرینی دووەمی هەمان ساڵ ژمارە ٢٣٨ و ٢٧٩ دوو پارچە نووسراوی عالی نێردراوە، بۆ ویلایەتی موسڵ نووسراوەتەوە و پاشای ناوهاتوو لە کۆتاییدا ئەرکەکەی گوازراوەتەوە بۆ موتەسەرفیەتی کنفری، بۆ ئەمەش هەواڵ دراوەتە ویلایەتی قەستەمۆنی، لە وەڵامی ویلایەتی ناوهاتووش دوو پارچە نووسراو وەرگیراوە و هاوپێچ پێشکەش کراوە، لە نووسراوی ویلایەتی قەستەمۆنی پاشای ناوبراو لە مێژووی دەست بە کار بوونی ئەم مووچەیەی کە وەریدەگرن چارەکی دەبردرێت و بە شوێنی مەبەست راگەیەندراوە، بەڵام بە تێروانین لە بابەتەکە نازانرێت ئەو برەی کە دەبردرێت، بۆ کوێ رەوان دەکرێت، بۆیە هیممەت بکرێت.




DH.MKT.00070.00042.001

| DH.MKT | 00070.00042 | 6 زيلحيجه 1310 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
ئـەم قەزایانـەی کـە لـە نـاو سـانجەقی کەرکووکـن، مووچـەی ژوورچیـەکان هـەر یەکـە چـوار قـوروش هاتۆتـە خـوارەوە و خراوەتـە سـەر مووچـەی حەسـەن ئاغـا ژوورچـی لـە قەڵەمـی تەحریراتـی ئەنجوومەنـی کارگێـڕی لیـوای ناوهاتـوو، بـەڵام ئەمـە گونجـاو نییـە، زیادەکـە لـە ٢٠ قـوروش پێـك دێـت، مووچـەی ناوهاتـوو بـە واڵا راگەیەنـدراوە و دراوەتـە قەڵەمـی فەرمانگـەی ناوەخـۆی شـورای دەوڵـەت، لەگـەڵ نـووسراوی پەیوەندیـداری سـەدارەتی ٣١ مایـس ١٣٠٩ و مەزبەتـە رەوان کـراوە، بـە گوێـرەی ئەمـە کاری لەسـەر بکرێـت.




ML.EEM.00160.00095.001

| ML.EEM | 00160.00095 | 18 ڕەبیعی یەکەم 1310 |
|---|---|---|

خەزینەی تایبەتی شاهانە
فەرمانگەی هومایۆنی ئێستا
ژمارە ٤٩٣٩
لـە ڕاگەیانـدن و پێشـکەش کردنـی عەتەبـەی عالیـە لەمـەڕ فەرمانی دەسـت بەسـەرکردن، مولکـی تایبەتـی خراوەتە سـەر مولکی تایبەتی جەنابی شـاهانە، لە قۆمسـیۆن نووسـڕاو ڕاگەیەندراوە، لە ویلایەتی موسـڵ سـانجەقی شـارەزور شـارۆچکەی کەرکـووك سـەنەدی ڕاگەیەنـدراو تۆمـار کراوە، چۆنیەتـی کارەکە ئاماژەی پێکـراوە و نـووسراو هەڵگیراوە.
سەنەدی فەرمانبەر



BEO.000184.013793.001

| 25 رەمەزان 1310 | 000184.013793 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>لـە وێنـەی بـاڵا نووسراوەتـەوە و نـووسراوی راگەیەندراویشـدا دەرچـووە و فەرمانـی پاشـای پەیوەندیـداری جەنابـی خەلافـەت بـۆ جێبەجـێ کردنـی لـە نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار داواکـراوە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.<br><br>لە بارەی دابینکراوەکانی سانجەقی کەرکووکی سەر بە ویلایەتی موسڵ | | |



| 25 شەعبان 1310 | 01302.000043 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٢٧٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ناوەکانـی سـانجەقەکانی زۆر و شـارەزۆر بەهـۆی لێـك چوونیانـەوە زۆربـەی کات تۆمـارەکان و نـووسراوەکان بـە هەڵـە بـۆ ئـەوی تـر دەگوازرێتـەوە و دەروات، بـۆ ئـەوەی شـتێکی لـەم جـۆرە کۆتایـی پـێ بێـت، نـاوی کۆنـی سـانجەقی شـارەزوور کەرکـووك بـووە، بۆیـە هـەر بـە نـاوی کەرکـووك نـاو بهێنرێتـەوە، لەگـەڵ ئـەوەی جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی، کەچـی بـۆ مامەڵـەی پێویسـت نـووسراو حەواڵـەی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار کـراوە، هەروەهـا مەزبەتـەی فەرمانگـەی ناوەخـۆی شـورای دەوڵـەت راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم




İ.PT.00002.00046.002

<table>
<tr><th>İ.PT</th><th>00002.00046</th><th>4 موحەررەم 1311</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣٦<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە ناو سانجەقی کەرکووك بە پێویست زانراوە هێلی تەلەگرافی قەزای کۆی سانجەق درێژ بکرێتەوە، لە لایەن دانیشتوانی خۆچێیەوە بەڵێن دراوە دابین بکرێت، گشت خەرجیەکە تەنیا بەهای کەلوپەلەکە نەبێت هەروەها کرێی گواستنەوەی ئەمانە بە ووشکانی و دەریایی بۆ خەرجی دروست کردنی تەلەگرافخانەکە و ئامادە کردنی ٤٨٦١ فرانك و ٥٠ سانتیم لەگەڵ ٣٢ هەزار و ٨٨٠ قوروش بە یەکجاری و مووچەی فەرمانبەرانی و نوێکردنەوە و نۆژەنکردنەوەی هێلەکە ئەرواقی سەر بەم بابەتە و ساڵانە و بە هەمیشەیی ٣٢٨ فرانك لەگەڵ ٢١ هەزار و ٨٤٠ قوروش خەرج کردنی جێبەجێ دەکرێت، لە کاتی دەرخستە روون بۆتەوە خەرجی ناوهاتوو لەسەر موزایەدەی ساڵی ١٣٠٩ زیاد دەکرێت و لە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستە ئاگاداری دەرچووە و دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار، لە فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەتیش مەزبەتە دەرچووە و هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



İ.TAL.00041.00005.012

| 26 رەبیعی کۆتایی 1311 | 00041.00005 | **İ.TAL** |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٢٢٢٣
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەمانە
بـاش کاتیبـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکـووك عەبدولحەکیـم ئەفەنـدی بەهـۆی ئەمەکـداری و شایستەی پاداشـتە، بۆیـە پلـەی سـێیەمی پێ ببەخشرێـت، لە پایـەی ویلایەتی موسـڵ بـە دووپاتکردنەوە نـووسراوی ٢٢ ئەیلـوول ١٣٠٩ ژمـارە ١٠٣ هاتـووە و هاوپێـچ و پۆسـتەی تۆمـاری کەسـێتی بەیەکەوە پێشـکەش کـراوە، هەروەها ئەگـەر بـە گونجـاو دەزانرێـت ناوبـراو پلـەی چوارەمـی پـێ ببەخشرێـت، بـەڵام لەسـەر رای جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت وەسـتاوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ




İ.TAL.00056.00001.009

<table>
<tr><td>İ.TAL</td><td>00056.00001</td><td>22 شەعبان 1311</td></tr>
<tr><td colspan="3">موتەسەرفی کەرکووك<br>ژمارە ٩٥٩<br>بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی ویلایەت<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>سەرۆکی فەرمانگەی شارەوانی کەرکووك حاجی مستەفا ئەفەندی لە بارەی بەدەست هێنانی مولکەوە خزمەتی پێشووی دیارە و شایەنی ڕێزگرتنە، دووبارە لە پلەی چوارەم پارچەیەك نیشانی مەجیدی پێ ببەخشرێت، بۆ ئەمەش فەرمان.<br>موتەسەرفی کەرکووك</td></tr>
</table>



DH.MKT.00163.00020.001

| DH.MKT | 00163.00020 | 23 رەبیعی کۆتایی 1311 |
|---|---|---|

جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
بـاش کاتیبـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکـووك عەبدولحەکیـم ئەفەنـدی بەهـۆی شایسـتە بـوون و ئەمەکداریەکەیـەوە پلـەی سـێیەمی پـێ ببەخشرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە پایـەی ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی دووپاتکردنـەوە لـە مێـژووی ٢٣ ئەیلـوول ١٣٠٩ ژمـارە ١٠٣ هاوپێـچ و تۆمـاری کەسـێتی نێـردراوە، هەروەهـا وا نیشـان دراوە ناوبـراو شـایەنی پلـەی چوارەمـە، بـەڵام لـەم بابەتـەدا فەرمانـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەتە.




DH.MKT.00199.00029.001

| DH.MKT | 00199.00029 | 7 ڕەجەب 1311 |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>لە سانجەقی کەرکووك قائیمقامی قەزای کۆی سانجەق عەباس ئەفەندی لە بەر کارە خراپەکانی لە شوێن خۆی بە زانیاری فەرمانبەری تایبەت لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، نووسراوی لێکۆڵینەوەکانی ناردووە، لەگەڵ پێشکەش کردنی نووسراوەکانی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ١٨ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ١٥٧، بە هاوکاری جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت جێبەجێ دەکرێت. | | |




DH.MKT.00201.00055.001

| 23 ڕەجەب 1311 | 00201.00055 | **DH.MKT** |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>ژورنالی ئاماری دارایی ساڵی ١٣٠٨ی سانجەقی کەرکووك نێردراوە، لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٢٥ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ١٦٢ لەگەڵ ژورنالەکان بەیەکەوە بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت نێردراوە، | | |



DH.MKT.00207.00058.001

| 12 شەعبان 1311 | 00207.00058 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت
لـە زانـاکان بـە نـاوی محەمـەد لامـع ئەفەنـدی بەهـۆی تەنگانەییـەوە لەلایـەن عولەمـا و دانیشـتوانی خۆچێییـەوە بـۆ بەرزکردنـەوەی بژێـوی داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری کەرکـووك پەسـەند کـراوە و بـۆ جێبەجـێ کردنـی داواکاریەکـە لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی ناوهاتـوو لـە مێـژووی ٥ تشرینـی یەکـەم ١٣٠٩ ژمـارە ١٠٦ لەگـەڵ داواکاریەکـە بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە گرنگـی بابەتەکـە بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە رای پەیوەندیدارانـی سـەدارەتە.



DH.MKT.00223.00053.001

| 11 شەوال 1311 | 00223.00053 | **DH.MKT** |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیداری سەدارەت
سەرۆكی شارەوانی سانجەقی كەركووك حاجی مستەفا ئەفەندی بەهۆی خزمەتە باشەكانی و ئەم پیاوەتەیەی نواندوویەتی، لە پلەی چوارەم نیشانی مەجیدی پێ بدرێت، بۆ ئەم مەبەستە لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی مێژووی ٢١ شوبات ١٣٠٩ هاوپێچ پێشكەش كراوە، بۆ جێبەجێ كردنی رای پەیوەندیدارانی سەدارەتە.



| DH.MKT | 00229.00036 | 17 شەوال 1311 |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
بەهـۆی خزمەتـە باشـەکانی فەرمانبـەری ناسـنامەی سـانجەقی کەرکـووك سـاڵح ئەفەنـدی بـۆ پلـەی دووەم پلەکـەی بـەرز بکرێتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ویلایەتـی موسـڵی شـکۆدار نـووسراوی مێـژووی ٢١ شـوبات ١٣٠٩ لەگـەڵ هاوپێـچ بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارە رای پەیوەندیـداری سـەدارەتە.




DH.MKT.00233.00001.001

| DH.MKT | 00233.00001 | 2 زیلقەعدە 1311 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت
ئەندامی پێشووی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك ئەمین ئەفەندی بەهۆی خزمەتەکانی پێشووی لە پلەی سێیەم بۆ پلەی دووەم بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەم ڕێزگرتنە لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار لە مێژووی ٢١ شوبات ١٣٠٩ نووسراو لەگەڵ هاوپێچ بەیەکەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە رای پەیوەندیداری سەدارەتە.



| 22 زیلقەعدە 1311 | 00241.00032 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
قـەزای رواندز سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك لـەم رێگایـە تێپەربوونـی داهـات تووشـی خـراپ بەکارهێنـان دەبێتـەوە، بـە مەبەسـتی لێکۆڵینـەوە بـە بریـاری ئەنجوومەنـی کارگێـری رۆژانـە ٥٠ قوروشـی بـۆ براوەتـەوە، جگـە لەمـە بـە مەرجـی دابیـن کردنـی خەرجـی رێـگا نێردراوەتـە ناوچەکـە، دوای ئـەوەی ئەرکەکـەی بـە تەواوەتـی جێبەجـێ کـردووە و گەراوەتـەوە، بـەڵام پارەکـەی نەدراوەتـێ گوایـە ئـەم ئەرکـە پێویسـتی بـە رۆژانـە نییـە، تەنیـا پێویسـتە خەرجـی رێگاکـەی پـێ بدرێـت، لـە ویلایەتـی شـکۆدار ئامـاژەی پێکـراوە، بـەم وێنەیـە زوڵمـی لێکـراوە، بۆیـە داواکـراوە هـەم رۆژانەکـەی هـەم خەرجـی رێگاکـەی بـۆ دابیـن بکرێـت، بـە هەندێـك ووتـەوە لـە ئەندامانـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکـووك محەمـەد ئەفەنـدی داواکاری پێشـکەش کـراوە بـە تێروانیـن لـە وێنـەی داواکاریەکـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.



DH.MKT.00241.00035.001

<table>
<tr><td>23 زیلقەعدە 1311</td><td>00241.00035</td><td>DH.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار<br>بەرێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك عەبدولرەحمان نافد ئەفەندی لەسەر هەندێك کردەوەی سەرپێچی و نەگونجاو و سکاڵاوە بە مۆری هەواڵگر سادق عەبدولقادر داواکاری نێردراوە هاوپێچ بۆ سەروو نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە لەگەڵ لێکۆڵینەوە ئەمەی روون دەبێتەوە بە گوێرەی حاڵەتەکە هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی.</td></tr>
</table>



| 22 سەفەر 1311 | 000270.020198 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـە ئاماژەی ویلایەتی موسـڵ لە دانیشـتوانی موسـڵ سـەعید بـەگ و رەئوف بـەگ لەگەڵ حاجی محەمەد لەسـەر کارە بەدەکانیـان ماوەیـەك لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی نیشـتەجێ بکرێـن، لەم بارەیـەوە بە فەرمانـی جەنابی پاشـای پەیوەندیـداری خەلافـەت فەرمـان دەرچـووە، بـە نـووسراوی تایبەتـی لـە مابەینـی هومایۆنـی بـاش کیتابەتـی شـکۆدار ئاماژەی پێکـراوە، ئەمـەش بـە تەلەگـراف نـووسراوی بـۆ دەرچـووە، لـە نەزارەتی شـکۆدار جێبەجـێ بکرێت. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

٥٢٢

Y.A.HUS 279/131

Y__A___HUS_.00279.00131.001

| Y.A.HUS | 00279.00131 | 21 سەفەر 1311 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٥٢٢
عەشیرەتەکانی شـکلفت و میـر یوسـف و میـر مەحمـود سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك، سـەرۆکەکانی بـە نـاوی مسـتەفا بـەگ و بەکـر بـەگ و خـضر بـەگ بـە هەڵوەشـاندنەوەی سـەرکردایەتیان بـۆ چاندنـی تووتـن لـە دە یـەك و لـە باجەکانـی تـر بـووراون، بـەڵام لـە باجەکانـی تـر داواکـراون، بۆیـە هانایـان بـۆ ئێـران بـردووە، ئەمـەش باڵیۆزخانـەی سـاوچبۆلاق رایگەیانـدووە، لـە عەشـائیرەکانی ناوهاتـوو کـە لـە ٤٠٠٠ خانـە پێـك هاتـووە، بـۆ ئـەوەی رێگـە لـە هانابردنیـان بگیرێـت، بـە ئامـاژەی باڵیۆزخانـەی تەهـران بـۆ نەزارەتـی دەرەوەی شـکۆدار نێـردراوە، سـەرۆکایەتی ناوهاتـوو بەهـۆی هەڵوەشـاندنەوەی و سـکاڵاوە نـووسراو بـۆ ویلایەتـی موسـڵ کـراوە، تەمەنـا دەکرێـت بـە پەیوەندیـداری خەلافـەت رابگەیەندرێـت.
سەدری ئەعزەم




BEO.000309.023121.002

| BEO | 000309.023121 | 28 رەبیعی کۆتایی 1311 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمار
وێنـەی ئـەم تەلەگرافنامەیـە کـە لـە مێـژووی ٢٦ تشرینـی یەکـەم ١٣٠٩ لـە ویلایەتـی موسـڵ هاتـووە لـە تەلەگرافنامـەی پایـەی بەندەمـان لـە مێـژووی ١٦ حوزەیـران ١٣٠٩ راگەیەنـدراوە، بـە بەڵگـەوە سـەلمێنراوە سـەعید چـاوش لـە ئەرکـی سـەربازی لایـداوە و لەگـەڵ ئەسـپ سـوارانی شـەمەر هێرشـی کردۆتـە سـەر هەندێـك گونـدی سـەر بـە کەرکـووك تێـدا دزی و تاڵانـی ئەنجـام داوە، لەلایـەن موتەسـەرفی کەرکـووك ئامـاژەی پێکـراوە ئەگـەر رابگەیەندرێـت و بەڵێـن بدرێـت لەلایـەن هـەر یـەك لـە سـەربازانی زەبتیـە و دانیشـتوانەوە ئـەوەی بـە زیندوویـی یاخـود بـە مردوویـی دەسـتگیری بـکات، ئـەوا وەکـو پاداشـت ٥٠ ئاڵتونـی عوسـمانی پـێ دەبەخشرێـت، ئـەم کاتـە لـە بەرژەوەنـدی هەمـوو لایـەك دەبێـت، هـەر کـە ناوبراویـش کەوتـە بـەر دەسـت ئـەم کاتـە تـکا دەکات و راسـتییەکان بـە پاشـا رادەگەیەنێـت، جێبەجـێ کردنـی ئەرکەکـەی موتەسـەرفی ناوهاتـووش یاخـود تکاکردنـی ناوبـراو لەسـەر رای پەیوەندیـداری سـەدارەت وەسـتاوە، فەرمـان.
عەزیز والی موسڵ



BEO.000336.025135.001

| BEO | 000336.025135 | 22 جەمادی کۆتایی 1311 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای پەیوەندیداری فەتوامان
دەرویش ئەفەندی موفتی پێشوو لەگەڵ منداڵ و کەسوکاری کە لە کەرکووك نیشتەجێیە، بەهۆی سەرپێچیەکانیەوە سکاڵا بەرز کراوەتەوە، تێدا ٣٩ واژووی تێدایە، لە مەرکەزی کۆپری تەلەگرافنامە دەرچووە، سەرەتا پرس بە ویلایەتی موسڵ کراوە، لەم بابەتەدا نووسراو لە ویلایەتی ناوهاتوو نێردراوە، هاوپێچ نێردراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار، لەوێشەوە بۆ پەیوەندیدارانی فەتوا نێردراوە، بە تێروانین لە نووسراوی مێژووی ١٧ جەمادی کۆتایی ١٣١١ ژمارە ٢٧٧٧ ئەگەر ناوبراو لەوێ بمێنێتەوە ئەوا ئاسایش تێك دەدات، لەلایەن والی پێشوو و ئێستا ئاماژەی پێکراوە، لە لایەنی ئەنادۆڵ لە نیابەتی سانجەقێك دابمەزرێت و پێویستە لە کەرکووك دوور بخرێتەوە، هەروەها دەرکەوتووە ناوبراو پێشووتر لە نیابەتی هەندێك لە سانجەقەکان کاری کردووە، کارەکە جێبەجێ بکرێت.



BEO.000345.025833.001

| BEO | 000345.025833 | 10 رەجەب 1311 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی پەیوەندیداری فەتوا
دەرویـش ئەفەنـدی موفتـی پێشـوو لـە کەرکـووک نیشـتەجێیە، پێویسـتە لـە کەرکـووک دوور بخرێتـەوە، بـە دامەزراندنـی لـە نیابەتـی سـانجەقێکی ئەنـادۆڵ، نـووسراو لـە ویلایەتـی موسـڵ نێـردراوە و هاوپێـچ لەگـەڵ ئـەم نـووسراوەی کـە لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار هاتـووە، بـە نـووسراوی مێـژووی ٢٢ جەمـادی کۆتایـی ١٣١١ بـۆ لایەنـی سـەدری ئەعـزەم نێـردراوە، بـە دووپاتکردنـەوە ئەمجـارە لـە نەزارەتـی ناوهاتـوو نـووسراوی مێـژووی سـەرەتای رەجـەب ١٣١١ ژمـارە ٢٩٣٤ هاتـووە لەگـەڵ تەلەگرافنامـەی ویلایـەت بـۆ پەیوەندیدارانـی شـێخایەتی نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت.


BEO.000393.029415.001

| 20 شەوال 1311 | 000393.029415 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی بازرگانی و نافیعەی شکۆدار
بە تێروانین لە خاڵی سەربازی و هاوسنووربوونی، سانجەقی سلێمانی گرنگی خۆی هەیە، بەهۆی نەبوونی ڕێگا و دەروازە لە حاڵەتێکە لە وەرزی زستاندا هاتووچۆی گونجاو نییە، مەرکەزی فرقە دەکەوێتە نێوان سلێمانی و کەرکووك، بۆیە پێویستە ڕێگایەك دروست بکرێت، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ نێردراوە لەگەڵ ئەو ئاماژەیەی کە پێشووتر نێردراوە، وەڵامەکەی لەلایەنی سەرعەسکەرەوە نێردراوە، لەگەڵ هاوپێچەکانی نووسراوی مێژووی ١٧ شەوال ١٣١١ ژمارە ١١٣ بۆ والا نێردراوە، لەم نووسراوەدا هاتووە؛ لەبەر ئەوەی شوێنی سلێمانی لە خاڵە گرنگەکانی سەربازییە لەگەڵ کەرکووك کە مەرکەزی فرقەی ڕەدیفی نیزامیەیە، ئاسانکاری بکرێت لە بەستنەوەیان و چاککردنی ڕێگاکانیان، لەبەر ئەوەی هەر خۆی ڕێگاکە هەیە، بەڵام پێویستی بە ڕێکخستن و چاککردنەوەیە، جگە لەمە لە لای چەپ و ڕاستی شتێك نییە ببێتە هاوکاریان، لەشکر و هاتووچۆی کەلوپەلی دانیشتوان و کڕین و فرۆشتنی بازرگان لەم ڕێگایەوە دەکرێت هەرچی زووە پەلە بکرێت لە دروست کردنی ڕێگای باسکراو، بە ئاماژەی موشیرەتی شکۆداری لەشکری شەشەمی هومایۆن دوای ووردبینی بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و ڕابگەیەندرێت، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە.



BEO.000377.028249.004

| 26 شەوال 1311 | 000377.028249 | BEO |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٤٩٤
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

بۆ ئەوەی عارف پاشا موتەسەرفی کەرکووك لە دەوڵەتی ئێران نیشان وەربگرێت، بە ڕێگەی عوسمان بەگ سەرۆکی عەشیرەتی جاف پەیوەندی بەستووە و دەست پێشغەری کردووە، بۆتە کۆیلەی ناوبراو، لەگەڵ ئەمەش بەهۆی خزمەتە باشەکانی پاشای ناوبراو ڕێزگرتنی لە جێبەجێ کردن دایە، ئاخۆ دوور بخرێتەوە یاخود حاڵی حازر سزا بدرێت پەیوەندی بە ویلایەتی موسڵ کراوە، بە نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ١٠ نیسان ١٣١٠ ژمارە ٣٦٠ بڕیاری لەسەر دەدرێت و دەنووسرێتەوە، بە ئاماژەی پێشوو وەڵام لە ویلایەتی ناوهاتوو لە مێژووی ١٥ نیسان ١٣١٠ و تەلەگرافنامەی بە شیفرە هاتووە دیاری کراوە کە حاڵی حازر سزا بدرێت، ئەمە گونجاوترین کارە، بە گوێرەی ئەم خوێندنەوەیە ڕای پەیوەندیداری سەدارەتیشی پێویستە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ




İ.ML.00012.00009.002

| İ.ML | 00012.00009 | 12 رەبیعی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٧٠٨
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك نـووسراوی ناحیـەی مەلحـە کۆتایـی هاتـووە و ناحیـەی کیلیـش تـازە نـووسراوی بـۆ کـراوە، بینینـی مامەڵـەی نـووسراو و بـاج هەروەهـا لـە رووی دارایـی باجـی سـاڵی ١٣٠٠ بـە نـووسراو رێکخـراوە و لەگـەڵ بەدەسـتهێنانی بـە مووچـەی ٣٠٠ قـوروش کاتیبێکـی بـاج دەسـت بەکار بێـت و مووچـەی باسـکراو بەرامبەر مووچـەی فرقـەی سـەیارە و بـۆ دەسـتکەوتنی ئـەم بـڕە پارانـەی کـە دەسـت بەسـەرن، نـووسراو بـۆ نەزارەتـی دارایی شـکۆدار کـراوە، لـە فەرمانگـەی ناوەخـۆی شـورای دەوڵـەت مەزبەتە رێکخـراوە و هاوپێـچ راگەیەندراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعززەم




İ.HUS.00032.00008.001

| I.HUS | 00032.00008 | 8 جەمادی کۆتایی 1312 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کاتیب
٥٠٤٣

لــە نێـوان عەشـیرەتەکانی رانیــە رووبەرووبوونــەوە و ناکۆکــی دروسـت بــووە، لــە رووی یاسـاییەوەش پێویسـت دەکات داواکــە بــۆ دادگای ســەرەتایی کەرکــووك و ســلێمانی یاخــود موســڵ بگوازرێتــەوە، لــە بــارەی جێبەجــێ کردنــی کارەکــە لــە ســەر ئامــاژەی نەزارەتــی دادی شــکۆدار لــە ویلایەتــی موســڵ تەلەگرافنامــە هاتــووە، هەروەهــا لــە نەزارەتــی ناوهاتــوو نــووسراو هاتــووە، بــە گواســتنەوەی هاوپێچــی نــووسراوەکان، لــە نــاو ئەفســەرانی ســەربازی ناوەخــۆ قۆمیســیۆنێك دامەزرێــت، بــۆ ئەمــەش لــە ئەنجوومەنــی تایبەتــی بریــکاران نــووسراو کــراوە، لــەم بابەتــە رەزامەنــدی وەرگرتــن لــە مێــژووی ٢٦ جەمــادی یەکــەم ١٣١٢ نــووسراوی تایبەتــی پەیوەندیدارانــی ســەدارەت لــە کاتــی پێشــکەش کــردن، لــە ســەروو تێروانینــی بــۆ دەکرێــت و لەبــەر نارێکــی و تێکچوونــی دیوانــی جەنگــی دەســتەیەك دادەمەزرێــت، تەنانــەت مامەڵــەی گەندەڵــی ئەرمەنەکانیــش لــە دادگای نیزامــی چاوپێداخشــاندنی بــۆ دەکرێــت، بۆیــە پێویســت بــەوە نــاکات لــە لایەنــی ســەربازییەوە ســەیری ئــەم بابەتــە بکرێــت، جگــە لەمــە دامەزراندنــی دەســتەیەك و ناردنــی گونجــاو نییــە، بــە تێروانیــن لــە نیــزام و نەریــت بــە گواســتنەوەی داواکــە و لــە داد بەهــۆی یەکســانی و دادپەروەرانــەی ئــەم لایەنــە، لەلایەنــی دادەوە ســەیری بابەتەکــە بکرێــت، جێبەجــێ کردنــی بــە فەرمانــی پاشــای جەنابــی پەیوەندیــداری خەلافــەت دەبێــت، لــەم بابەتــەدا بریــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەم کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.
جەنابی سەر کاتیب




İ.HUS.00034.00081.004

<table>
<tr><td>1312 شەعبان 23</td><td>00034.00081</td><td>İ.HUS</td></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کاتیب<br>٨٠٩٧<br>ویلایەتی موسڵ لە بارودۆخێکە جێگای بەزەییە، شێخەکانی مارتینی و هانری و جبەخانە دەگوازنەوە و جولەی نەگونجاو ئەنجام دەدەن، جگە لەمە لە بارەی سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی زانیاری پوختە لەلایەن سیخورەکانەوە هاتووە، لە کەرکووکەوە یوزباشی فەرید تەلەگرافنامەی بە واژوو نێردراوە، وێنەیەکی هاوپێچ بۆ پاشا نێردراوە، لە ویلایەت لە بابەتی زانیاری لەم وەڵامەی وەردەگیرێت لەلایەن جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرمانی پاشا دەردەچێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>سەر کاتیب</td></tr>
</table>




İ.TAL.00066.00032.008

| İ.TAL | 00066.00032 | 27 سەفەر 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ۱۹۰۰
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندەمانە

ئــەم ناکۆکــی و رووبەڕووبوونــەوەی لــە نێــوان هەمەوەنــدەکان و عەشــیرەتی شــێخ بزێنــی روویــداوە، بــۆ نەهێشــتنی شــەر و ناکۆکیەکانیــان و ئاشــت کردنەوەیــان و گەڕانــەوەی کەلوپەلــە تــاڵان کــراوەکان و رادەســت کردنەوەیــان ئاغــای بلۆکــی تابــووری ســەربازی زەبتیــەی بلۆکــی شەشــەمی ســوارە ســەید ئیبراهیــم وەلــەدی ئەفەنــدی خزمەتــی باشــی کــردووە، بۆیــە بــۆ ڕێزلێنانــی لــە پلــەی چــوارەم یــەك پارچــە نیشــانی عوســمانی پــێ بدرێــت، بــۆ ئەمــەش لــە ویلایەتــی موســڵی شــکۆدار نــووسراوی مێــژووی ٢١ حوزەیــران ١٣١٠ ژمــارە ٤٦ نێــردراوە و هاوپێــچ پێشــکەش کــراوە، بــۆ وەرگرتنــی ڕەزامەنــدی پەیوەندیــداری ســەدارەت لــەم بابەتــەدا بریــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەم کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ




DH.ŞFR.00168.00114.001

<table>
<tr><th>DH.ŞFR</th><th>00168.00114</th><th>18 رەبیعی یەکەم 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">تەلەگرافنامە<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لـە دژی موتەسـەرفی سـانجەقی سـلێمانی لێکۆڵینـەوە ئەنجـام دراوە، لـەم بارەیـەوە لێکۆڵینەوەکـە بـۆ لیـوای ناوهاتـوو نێـردراوە و حەواڵـەی دەفتـەرداری ویلایـەت کـراوە، لـە ئۆغستۆسـی ١٣١٠ تەلەگرافنامـە راگەیەنـدراوە، لـەم بارەیـەوە ئـەو نـووسراوەی بـۆ دەفتـەرداری ناوهاتـوو نـووسراوە، خەریکـە دەگاتـە دەسـتی و بـۆ موتەسـەرفی کەرکـووك نێـردراوە، لـە نـاو سـانجەقی سـلێمانی لـە نێـوان هەندێـك فرقـەی عەشـیرەتەکانی جـاف رووبەرووبوونـەوە روویـداوە، بۆیـە بـە گوێـرەی شـوێنەکە ئەنجامدانـی لێکۆڵینـەوەی باسـکراو گونجـاو نییـە و بـۆ کاتێکـی تـر دوابخرێـت، راگەیەنـدراوە.<br>عەزیز والی موسڵ</td></tr>
</table>





| DH.ŞFR | 00173.00038 | 24 شەوال 1312 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك لـە هۆبـەی موڵکـی هومایۆنـی شـەمامك، کـە سـەر بـە قـەزای هەولێـرە، لەلایـەن یەکێـك لـە ئاغاکانـی هـۆزی دیزەیـی بـە نـاوی بایـز ئاغـازادە ئیبراهیـم ئاغـا هێرشـی کردۆتـە سـەر کارگێـری موڵکـی ناوهاتـوو، بـە دەسـتدرێژی کـردن، فەرمانبەرانـی خسـتۆتە تەنگانـەوە، هێرشـەکەش بـە ٤٠ تـا ٥٠ چەکـدار لـە کەسـوکار و کـوڕە مامەکانـی ئەنجـام دراوە، لـە بـاش کاتیـب حاجـی عەبدوڵـلا ئەفەندیـان داوە و سـووکایەتیان پـێ کـردووە، دوای پەرشـوبڵاوکردنیان روویـان لـە هەولێـر کـردووە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارە لـە سـەرۆکایەتی قۆمیسـیۆنی مولکـی هومایۆنـی موسـڵ راگەیەنـدراو هاتـووە، وەکـو یـەدەگ لـە ژێر موشیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن لێکۆڵینـەوە لـە کارەکـە دەکرێـت، بـە گوێـرەی لێکۆڵینەوەکـە جێبەجـێ کردنەکـەی لـە موتەسـەرفی کەرکـووك بـۆ قائیمقامیەتـی هەولێـر نێـردراوە، هەروەهـا لـە ئاغاکانـی عەشـیرەتی ناوبـراو بـە دەسـتەواژەی فارسـی داواکاری هاتـووە، لـە لێکۆڵینـەوەدا دەرکەوتـووە ئەوانـە لـە جیاتی ملکەچ بوونیـان بـۆ دەوڵـەت، کاتیبـی ناوبـراو لـە هۆبـەی ناوهاتـوو هانـی هۆبەکـە دەدات، و بیرۆکـەی هۆزگـەری هەیـە و خۆشـی کەسـێکی ئـارام نییـە، داواکـراوە ئەرکـی ناوبـراو بگۆردرێـت و کەسـێکی تـر دابنرێـت، ئەگەرچـی مامەڵـەی ئاغاکانـی دیزەیـی جێـگای قەبـوڵ نییـە، بـەڵام لێکۆڵینـەوە کـراوە، ئەنجامـی لێکۆڵینەوەکـەش رادەگەیەندرێـت، فەرمـان.
والی موسڵ عەزیز





<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>00223.00043</td><td>18 ره‌جه‌ب 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">ئه‌نجوومه‌نی كارگێری لیوای كه‌ركووك<br>٧٦٦<br>بۆ ویلایه‌تی موسڵ<br>لـه‌ شـارۆچكه‌ی هه‌ولێـر عوسـمان ئه‌فه‌نـدی زاده‌ محه‌مـه‌د ئه‌فه‌نـدی بـه‌ وانـه‌ ووتنـه‌وه‌ سـه‌رقاڵه‌، به‌راسـتی یه‌كێكـه‌ لـه‌ خانه‌دانه‌كانـی زانایـان، هه‌روه‌هـا لـه‌ رووی بژێویـه‌وه‌ تووشـی ته‌نگانـه‌ و په‌رێشـانی بـووه‌، بـۆ ئـه‌و مه‌به‌سـته‌ مووچه‌یه‌كـی دیاریكـراوی بـۆ ببرێتـه‌وه‌، داواكاری لـه‌ ئه‌نجوومه‌نـی كارگێـری لـه‌ مێـژووی ٢٢ كانوونـی یه‌كـه‌م سـاڵی ١٣١٠ بـه‌ ژمـاره‌ ٣٢٤ هاتـووه‌، كـه‌ لـه‌ خه‌زینـه‌ی دارایـی یاخـود لـه‌ ئاوقـاف مانگانـه‌ ٣٠٠ قوروشـی بـۆ ببرێتـه‌وه‌، بریـار و فه‌رمـان بـۆ ئـه‌م كه‌سـه‌یه‌ كـه‌ فه‌رمـان ده‌رده‌كات.</td></tr>
</table>

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>00223.00043</td><td>20 ره‌جه‌ب 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">قه‌ڵه‌می تۆماری ویلایه‌تی موسڵ<br>ژماره‌ ٢٠٥<br>بۆ نه‌زاره‌تی ناوه‌خۆ<br>له‌ قـه‌زای هه‌ولێـر عوسـمان ئه‌فه‌نـدی زاده‌ محه‌مـه‌د ئه‌فه‌نـدی بـه‌ ووتنـه‌وه‌ی زانسـت و زانیـاری سـه‌رقاڵه‌، بژێـوی خـراپ و په‌رێشـانه‌، بۆیـه‌ له‌ بـاره‌ی برینه‌وه‌ی مووچه‌یه‌كـی دیاریكـراو، داواكاری له‌ ئه‌نجوومه‌نی كارگێری سـانجه‌قی كه‌ركـووك نێردراوه‌تـه‌ په‌یوه‌ندیدارانـی نـه‌زاره‌ت، بریـار و فه‌رمـان بـۆ ئـه‌م كه‌سـه‌یه‌ كـه‌ فه‌رمـان ده‌رده‌كات.<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>



| 15 رەبیعی یەکەم 1312 | 00228.00054 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت
لە سانجەقی کەرکووك بەڕێوەبەری ناحیەی مەلحە بە ناوی حەسەن شاکر ئەفەندی لە کاتی ئەرکەکەی خزمەتی باشی کردووە و توانیویەتی کەلوپەلە تالانکراوەکان لە ژێر دەستی چەتەکان بگەڕێنێتەوە، بۆیە لە پلەی پێنجەم ڕێزی لێ بگیرێت، لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار نووسراو هاتووە و دوو پارچە نووسراو و هاوپێچ لەگەڵ تۆماری زانیاری پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی کارەکە رای پەیوەندیداری سەدارەتە.



DH.MKT.00277.00018.001

| DH.MKT | 00277.00018 | 27 سەفەر 1312 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت

بـــۆ گەرانـــەوەی ئـــەم کەلوپەلـــە تاڵانکراوانـــەی کـــە لـــە نێـــوان رووبەرووبوونـــەوەی عەشـــیرەتەکانی هەمەوەنـد و شـێخ بزێنـی تـاڵان کـراوە، ئاغـای بلـۆك سـەید ئیبراهیـم وەلـد ئەفەنـدی لـە بلۆکـی شەشـەمی سـوارەی تابـووری سـەربازی زەبتیـە کاری باشـی کـردووە و شـایەدی کار و خزمەتەکانـی بووینـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە پێویسـتە رێـزی لـێ بگیرێـت و لـە پلـەی چـوارەم یـەك پارچـە نیشـانی عوسـمانی عالـی پـێ بدرێـت، لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی مێـژووی ٢١ حوزەیـران ١٣١٠ ژمـارە ٤٦ لەگـەڵ هاوپێـچ بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە رای پەیوەندیدارانـی سـەدارەتە.



| DH.MKT | 00280.00032 | 8 رەبیعی یەکەم 1312 |
| --- | --- | --- |
| لـە قـەزای هەولێـر سـەر بە سـانجەقی کەرکووك سـەرۆکی عەشـیرەتی دزەیی محەمـەد ئاغا بە هۆی باشـی کارەکانی و دڵسـۆزیەوە، پلەکـەی بـۆ قەپوچـی باشـی تەویلـەی کۆشـکی پاشـا بەرز بکرێتـەوە، بۆ ئەم مەبەسـتە لـە ویلایەتی موسـڵ نـووسراو بـە مێژووی ٧ تەممـوز ١٣١٠ ژمارە ٥٦ هاتووە، کە بە رێگەی فەرمانگەی تەشریفات پێشـکەش کراوە. | | |



DH.MKT.00281.00050.001

| DH.MKT | 00281.00050 | 11 رەبیعی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

نەزارەتی دادی شکۆدار
کەسانێك بە ناوی ئاودڵ و رەسول بە سزای لەسێدارەدان لە زیندانن، لەسەر هەندێك کاری جێبەجێ کردندا لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك مەزبەتە نێردراوە، تێدا هەمان بابەت دەرکەوتووە و باسکراوە، نووسراو لە ویلایەتی موسڵ لە ٣٠ تەمموز ١٣١٠ بەیەکەوە نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکەدا هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MKT.00292.00030.001

| 8 رەبیعی کۆتایی 1312 | 00292.00030 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
بەبێ هـۆکار لـە ئەرکەکـەی دوورخراوەتـەوە و خراوەتـە ژێـر چاودێریـەوە، لەبـەر مەغدوریەکـەی داواکاری بـەرز کردۆتـەوە، بـە مۆری مولازمی ئەندامی دادگای سـەرەتایی زەینەلعابدین داواکاری نێـردراوە و بۆ عالی بەرز کراوەتەوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە بـە پێویسـت زانـراوە ووردبینیـی بـۆ بابەتەکـە بکرێـت و راسـتییەکە رابگەیەندرێـت.



DH.MKT.00300.00074.001

| DH.MKT | 00300.00074 | 27 رەجەب 1312 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیداری سەدارەت
ناوچـەی لاهیجـان کـە لەگـەڵ سـنووری خاقانـی هاوسـنوورە، لەسـەر هەندێـك ووتـە لـە موتەسـەرفی کەرکووکـەوە نـووسراو نێـردراوە لەگـەڵ ناردنـی هاوپێـچ و بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی ١٧ ئەیلـوول ١٣١٠ بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت.



| 6 جەمادی یەکەم 1312 | 00304.00023 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>ئیمامی قۆناغی حکوومەتی سانجەقی کەرکووك عەبدولقادر ئەفەندی لەبەر دەستکورتی و خراپی بژێویەوە مووچەیەکی گونجاوی بۆ ببرێتەوە، لەم بارەیەوە لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار لە مێژووی ١١ حوزەیران ١٣١٠ نووسراوی ژمارە ٣٩ لەگەڵ هاوپێچ پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی کارەکە لەسەر رای پەیوەندیداری سەدارەت وەستاوە. | | |




DH.MKT.00309.00060.001

| DH.MKT | 00309.00060 | 22 جەمادی یەکەم 1312 |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار<br>لە ناو سانجەقی کەرکووك لە فەرمانبەری ناسنامە قەزای رانیە عەزیز ئەفەندی و لە تۆماری جەمیل ئەفەندی دادەمەزرێن، بۆ ئەمەش لەسەر نووسراوی عالی لە مێژووی ٢١ ئۆغستۆس ١٣١٠ چەسپێنراوە، هەروەها لە ناوبراوان عەزیز ئەفەندی بە تۆمار مانگانە ٢٥٠ و جەمیل ئەفەندی ١٢٥ قوروش مووچەیان بۆ دابینکراوە، ناوبراوان لە مێژووی دەست بە کار بوونیان و مێژووی دەست لە کێشانەوەیان بە گوێرەی بریاری نیزام مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، هەروەها عەزیز ئەفەندی پەیوەستە بە کەفالەتەوە ئەو سەنەدەی لێی وەردەگیرێت لە ژمێریاری ویلایەت هەڵدەگیرێت، لەم بارەیەوە سەروو ئاگادار کراوەتەوە و لە ژمێریاری باسکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |




DH.MKT.00310.00066.001

| DH.MKT | 00310.00066 | 25 جەمادی یەکەم1312 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیداری سەدارەت
بـاش کاتیبـی ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکـووك عەبدولحەکیـم ئەفەنـدی بەهـۆی لێهاتـووی و پیاوەتیـەوە شـایەنی ئەوەیـە پلەکـەی لـە پلـەی چـوارەم بـۆ پلـەی سـێیەم بـەرز بکرێتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ویلایەتـی موسڵ نـووسراوی مێـژووی ٨ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ و تۆمـاری زانیـاری بەیەکـەوە پێشـکەش کـراوە.



| 26 جەمادی یەکەم 1312 | 00311.00041 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>لە ناو سانجەقی کەرکووك، خوالێخۆشبوو حاجی عومەر ئەفەندی زادە حاجی ئەسعەد ئەفەندی خولەفای تەریقەتی نەقشبەندی نیشتەجێی شارۆچکەی کۆی سانجەقە، بەڵام لە شارۆچکەی ناوهاتوو خانەقاکەی وێران بووە، هەروەها بە خۆی لەم زانایانەیە کە شایانی میهرەبانیە و جیگەی سەدەقەی جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەتە، لە بارەی برینەوەی مووچەیەکی دیاریکراو، نووسراو لە مێژووی ١٨ ئەیلوول ١٣١٠ ژمارە ١١١ لە ویلایەتی موسڵ بە هاوپێچەوە پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بریار و فەرمان. | | |



DH.MKT.00316.00068.002

| DH.MKT | 00316.00068 | 11 جەمادی کۆتایی 1312 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی
قائیمقامی قەزای سەڵاحیەی سانجەقی کەرکووك وەلی ئەفەندی بەهۆی خزمەتە باشەکانی بە بەرزکردنەوەی بۆ پلەی سێیەم هەروەها بەڕێوەبەری ئەوراقی لیوای ناوهاتوو ساقی ئەفەندی دووبارە بۆ پلەی چوارەم و کاتیبی تەحریراتی قەزای ناوهاتوو خضر فەهمی ئەفەندی بە پلەی پێنجەم ڕێزیان لێ بگیرێت، بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار نووسراوی ١٦ کانوونی یەکەم ١٣٠٩ لەگەڵ تۆماری تەحریراتی کەسێتی پێشکەش کراوە، رای پەیوەندیداری سەدارەتی پێویستە.



| 16 ڕەجەب 1312 | 00331.00066 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار<br>ئیکرامیـەی حەرەمەینـی موحتەرەمیـن وەکـو پاداشـتی دانیشـتوان لـە موتەسـەرفیەتی سـانجەقی کەرکـووك لـە نـووسراوی مێـژووی ١١ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ نێـردراوە، بـری ١٣٤٢ قـوروش و نیـو پـارەی نەقـد لەگـەڵ ٧ قـوروش و نیـو قـوروش سـەنەد لـە نەزارەتـی ژمێریـاری ڕێکخـراوە و نێـردراوە، دوو پارچـە پسـولەی سـەنەدی نـووسراو دراوەتـە موتەسـەرفی ناوهاتـوو. | | |




کرکوک متصرفلغی

۵۹۸

DH.MKT 334/19

DH.MKT.00334.00019.001

| 8 جەمادی یەکەم 1312 | 00334.00019 | DH.MKT |
|---|---|---|

موتەسەرفیەتی کەرکووک
٥٩٨
بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی ویلایەت
جەنابی ئەفەندم
ئـەم داواکاریـەی کـە لەلایـەن میـری ئـاڵای ٣١ پێشکەشـی جەنابـی پەیوەندیدارانـی ویلایـەت کـراوە، هاوپێـچ فەرماننامـەی خدێوانـەی عالـی لـە ١٩ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ ئامـاژەی پێکـراوە، لـە کاتـی حەواڵـە کردنـی داهاتـی دە یـەك کـە مـن لـەوێ ئامـادە بـووم، سـەرۆکی شـارەوانی قـەزای کـۆی سـانجەق سـادق ئاغـا هـەوڵ و کۆششـی زۆری دا و هـاوکاری سـەربازی شـاهانەی کـرد، لـە گواسـتنەوە و ئامادەکارییەکانیشـدا بـە هەمـان شـێوە، هەروەهـا لـە زیادکردنـی دە یەکـدا دڵسـۆزی و نـەرم و نیانـی هەبـووە جگـە لەمـەش لـە ئـاو و ئاوەرۆکانـی مەملەکـەت لـە نۆژەنکردنـەوە و خاوێـن کردنـەوەی خزمەتـی باشـی کـردووە، بۆیـە لـە قائیمقامیەتـی خۆچێـی کارەکان کۆتایـی پـێ هاتـووە، ئاغـای ناوبـراو پلەیەکـی گونجـاو لەگـەڵ نیشـانێك رێـزی لـێ بگیرێـت، را و بریـار بـۆ جەنابـی خدیوانـەی پایەبـەرزە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
عوسمان ژمێریاری وەکیلی موتەسەرفی کەرکووک

| 17 رەجەب 1312 | 00337.00013 | DH.MKT |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران
ژمارە ٦٨٥
قـەزای رانیـە سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك دەکەوێتـە سـنووری ئێـران، خەڵکەکەشـی لەگـەڵ یـەك دوژمنـی یەکـترن، لـە تاقمێـك هـۆز و خێـل پێك هاتـوون، ناوە نـاوە لـە نێوانیـان ناکۆکـی و رووبەڕووبوونـەوە روو دەدات، بەڵام دوو سێ مانـگ پێش ئێسـتا لـە قائیمقامیەتـی قـەزای ناوهاتـوو محەمـەد سـەبری ئەفەنـدی دامـەزراوە، بـۆ یـەك رۆژیـش بێـت هەڵسوکەوتی خراپـی نەبیـنراوە، بـەڵام ناتوانێـت لەگـەڵ عەقڵـی هۆزگەرایەتـی ئاوێتـە بێـت، لەبـەر گرنگـی و شـوێنی جوگرافـی قـەزای ناوهاتـووش قائیمقامێـك دابمەزرێـت بەرامبـەر ئـەم وەحشـیەتە بە توانا و لێهاتوو بێـت، هەروەهـا لـە خانەدانـی رواندز سـەعید بـەگ ئـەم تایبەتمەندییانـەی تێدایـە و لـە بەڕێوەبردنـی کارگێڕیـدا لێهاتـووە و نـاودارە، ناوبـراو بنێردرێتـە قائیمقامیەتـی رانیـە و قائیمقامـی کـۆی سـانجەق عەبـاس ئەفەنـدی لەلایـەن رکابەرەکانـی گیـراوە لەبـەر ئـەوەی ئـەم کاغـەزە لێکۆڵینەوانـەی کـە پێشکەشـی شـورای دەوڵـەت کـراوە هێشـتا ئەنجامێکـی نەبـووە، هەروەهـا ناوبـراو لەگـەڵ کەشـوهەوای شـوێنەکە ئاوێتـە نابێـت، بـە دڵتەنگیـەوە گەڕاوەتـەوە مەرکـەزی لیـوا، لەبـەر ئـەوەی کاروبـاری کارگێـڕی قەزاکـە بـە وەکالـەت بەڕێـوە دەبردرێـت، محەمـەد سـەبری ئەفەنـدی لـە سـانجەقی سـلێمانی بـۆ قائیمقامیەتـی شـەهربازار و قائیمقامـی شـەهربازار شـەوقی ئەفەنـدی بـۆ قائیمقامیەتـی کـۆی سـانجەق رەوان بکرێـت و گۆڕینەوەیـان پـێ بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش لـە ویلایەتی موسـڵی شـکۆدار نـووسراوی مێـژووی ٢٢ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ ژمـارە ٤٤ هاتـووە و حەواڵـە کـراوە و تێیـدا ئاماژەی پێکـراوە.
لـە کاتـی ئـەم ووردبینیـەی کـە کـراوە، دەرکەوتـووە سـەعید بـەگ لـە هەڵبژێـردراوەکان نییـە، لـە بـارەی قائیمقامـی کـۆی سـانجەقیش دەسـتگیرکراوە و بـە گوێـرەی نـووسراوی لێکۆڵینـەوە پێویسـتە دووربخرێتـەوە، ئـەم بڕیارنامەیـەی کـە لـە شـورای دەوڵـەت رێکخـراوە، نیشـانی داوە کـە لەگـەڵ راگەیاندنـی گۆڕینـەوەی پـێ بکرێـت، لـە شـوێن ئـەو کەسـێکی تـر دابمەزرێـت، ئەمـەش بـە نـووسراوی عالـی ئامـاژەی پێکـراوە، لەگـەڵ بڕیارنامـەی مێـژووی ٨ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ ژمـارە ٤٨٥ محەمـەد سـەعید هەڵبژاردنـی رابگەیەندرێـت و بـۆ دەسـت پێکردنـی ئەرکەکـەی بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا فەرموویەتـی، ئەگەرچـی گۆڕینـەوەی قائیمقامـەکان پێویسـتە و گرنگـە بـەڵام بـە گوێـرەی بنەمـا دەبـێ بـە بڕیارنامـە رایگەیەندرێـت، لـەم بارەیـەوە لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو نـووسراو کـراوە، لـەم بابەتـە بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
مۆری قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی مولکیە



| 1312 شەعبان 5 | 00339.00015 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
موتەســەرفی پێشــووی مــوش جەنابــی جــەلال پاشــا لــە موتەســەرفی ســانجەقی کەرکــووك دامــەزراوە، خەرجــی ڕێــگای ٤٢٣٧ قــوروش و نیــوە، لــە ویلایەتــی بەتلیــس جێبەجــێ کــراوە، هەروەهــا تەفەروعاتەکەشــی لــە نــووسراوی مێــژووی ٢٧ تشرینــی یەکــەم ١٣١٠ ڕوون کراوەتــەوە، ئەمجــارە لەلایــەن ناوبــراوەوە تەلەگرافنامــە هاتــووە خەرجــی ڕێــگای باســکراو وەرنەگیــراوە، داواکــراوە لــەوێ جێبەجــێ بکرێــت، ئەگــەر بێتــو ڕاســتی ئەم ئــەم بابەتە لــە ویلایەتی ناوهاتــوو و بــە پەیوەنــدی کــردن نــەدراوە، ئــەوا لــە خشــتەی خەرجــی تۆمار بکرێــت و لــە ژمێریــاری ڕابگەیەندرێت.



DH.MKT.00368.00037.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>00368.00037</td><td>20 شەوال 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>ئەنجوومەنی دارایی<br>ژمارە ٩١<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندیم<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ خەرجی تووتنی سانجەقی کەرکووك ٢٠٠٠٠٠ کیلۆیە، بۆ بری ناوبراو تەنیا ١٠٠٠٠ کیلۆ رسوماتی هەیە و سوودی لێ بینراوە، قاچاغی تووتن بە شێوەیەك فراوان بووە زۆرێك لە عەشیرەتە کوردەکان لەوانە بە ناوی شێخ عەلی ئەفەندی قاچاغی پێوە دەکەن، لەم بابەتەدا زانیاری بدرێتە شوێنی خۆی، نووسراوی قۆمیسیۆنی بەرێوەبەرایەتی گشتی رەژی لەگەڵ نووسراوی ئەنجوومەنی دارایی هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە تێروانین لەم بابەتەدا کارەکە جێبەجێ بکرێت و بە نووسراو ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت و نووسراوی ناوهاتوو رەوان بکرێتەوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری دارایی</td></tr>
</table>



| DH. MKT | 00380.00042 | 17 زیلقەعدە 1312 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٥١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

دوو کەس لە پۆلیسی سوارەی سلێمانی بە جانتای پۆستەوە دەرچوونە، لە ناوچەی باش بۆلاق رووبەرووی چەتەکان بوونەتەوە، چەتەکان بە سێ سوار و پێنج پیادە هێرشیان کردۆتە سەر ناوبراوان، لە کاتی شەڕدا هەموو نووسراوەکانی پۆستەخانە لەناوچوونە، هەروەها چەتەی عەشیرەتی دیزەیی ئیبراهیم بایز بە هاوکاری ١٥٠ ئەسپ سوار لە گوندەکانی نێوان هەولێر و ئاڵتون کۆپری سوراونەتەوە و لە نێوان ئەم دوو قەزایە هێرشی کردۆتە سەر پۆستەچیەکان، بۆ چاودێری کردن سەربازی شاهانە دەرچوونە، لە هەولێر بۆ ماوەی دوو کاتژمێر رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە، هەروەها هەواڵ دراوە کە ئەم پۆستانەی لە موسڵ و زاب بە دوو پۆلیس دەگوازرێنەوە، و ئەم پۆستانەی لە سلێمانیش دەردەچن لە پێنج کەس کەمتر نەبێت، و لە موسڵ و کەرکووک و ناو ویلایەتیش پێویستە زۆر بە ووردی چاودێری بکرێت و لە گواستنەوەی پۆستەکاندا پۆلیسی زیاتر بنێردرێت، هەروەها بۆ چاودێری کردنی کاغەزەکانی پۆلیس چوونەتە ویلایەتی موسڵ، بۆ چاودێری کردنی یەکتر لە بەرێوەبەرایەتی پۆستە و تەلەگراف لە بەغدادیش بەردەوام تەلەگرافنامە هاتووە، ئاماژەی پێکردووە کە دەبێ بە پێی پێویست رێگاکان پارێزگاریان لێ بکرێت، ئەمەشیان لە سەر ئەستۆی حکوومەتی ناوچەکەیە، جگە لەمەش هەر لە بارەی پاراستن و چاودێری کردنی رێگای پۆستە ئاگادارتان دەکەینەوە.
نازری پۆستە و تەلەگراف




BEO.000454.033981.002

| BEO | 000454.033981 | 8 سەفەر 1312 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمار
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە
لـە ٣ ئۆغسـتۆس ١٣١٠ عەبدولرەحـمان بابـان لـە خێزانەکـەی خـۆی دابـراوە، سـەرەتا لـە بازیـان و ناوەنـدی مەرکـەز لـە نـاو زاخـۆ و کەرکـووك لـە سـەڵاحیە و رانیـە بـە وەکالـەت قائیمقـام بـووە، هەروەهـا ماوەیەکیـش وەکـو ئەنـدام لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری خزمەتـی کـردووە، کاری باشـی کـردووە و هـەر خـۆی توانیوەتـی لـە بەرامبـەر بیرۆکـە و خـوی هۆزگەریـەوە بوەسـتێت، بۆیـە ماوەیەکـە بـە وەکالـەت لـە قـەزای زێبـار وەکـو قائیمقـام بـە وەکالـەت دامـەزراوە، جگـە لـەوەی سوپاسـگوزاری جەنابـی پاشـای پـێ دراوە، لـە هەمـان کاتـدا بـە شـێوەیەك قـەزای ناوبـراو لـە ژێـر پارێـزگاری خـۆی هێشـتۆتەوە، بـە پێشـکەش کردنـی ئـەو روونکردنەوانـە لـە پەیوەندیدارانـی وەکالـەت کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.
والی عەزیز


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
459 | 34364

BEO.000459.034364.001

| 17 سەفەر 1312 | 000459.034364 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتەکانی بەغداد و موسڵ
عەشیرەتی زەنگەنە کە لە سانجەقی کەرکووك نیشتەجێن، بەهۆی دەستدرێژی عەشیرەتی جاف لە کۆنەوە پەرشوبڵاوبوونەتەوە، ئەوەی ماوەتەوە ٣٠٠ خانە دەچنە ئێران، لەم ماوەیەدا کار بکرێت بۆ پارێزگاری کردنیان و ڕێزگرتنی سەرۆکەکەیان حەسەن ئاغا، جگە لەمە لەم ناوچانەی کە ئەوان تێدا نیشتەجێن سەرباز جێگیر بکرێت، تا پارێزگاریان لێ بکات، بۆ ئەم چارەسەرە بە ئاماژەی موشیرەتی لەشکری شەشەم بە لایەنی سەرعەسکەر ڕاگەیەندراوە، ناوبراو حەسەن ئاغاش لە سلکی زەبتیەی بەغداد ئەرکی پێ بدرێت، بلۆکی سوارەی پێ بدرێت، بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشا دەرچووە، چ ئەمانە و چ گشت عەشیرەتەکانی تر لە دەستدرێژی جافەکان بپارێزرێن و ئاگاداری بدرێتە ویلایەتەکانی موسڵ و بەغداد و زانیاری دراوەتە سەر عەسکەریمان.



BEO.000459.034397.001

| 16 سەفەر 1312 | 000459.034397 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی داد و ویلایەتی موسڵی شکۆدار

لەلایـەن حکوومەتـی کەرکـووك ئەرکـی پێـدراوە، کەچـی هێـزی ناردۆتـە سـەر ئاغـای تابـور و ٣٠٠٠ قـوروش پـارە و کەلوپەلـی تاڵانکـراوە، هـەر خۆشـی بـە کوشـتنی برادەرزادەکـەی تاوانبـار کـراوە، لەبـەر ئـەم کێشـەوە تـا ئەمـڕۆ لـە ترسـان لـە سـنووری ئێـران دەسـوڕێتەوە و خـۆی خسـتۆتە ژێـر پارێـزگاری حکوومەتـی ئێـران، لەبـەر ئـەوەی غـەدری لێکـراوە، ڕێگـە بدرێـت وەکـو جـاران لـە شـوێنی خـۆی نیشـتەجێ ببێتـەوە، یاخـود لـە موتەسـەرفی کەرکـووك ئەمنیەتـی پارێـزراو نییـە و لەگـەڵ داواکـراوان دادگاییەکـەی جێبەجـێ دەکرێـت، چۆنیەتـی کارەکـەش حەواڵـەی دادگای سـانجەقی سـلێمانی بـووە، بـە واژووی بەکـر سـدقی تەلەگرافنامـە لـە مەرکـەزی سـلێمانی بـۆ پایـەی عالـی دەرچـووە، داوای کـردووە ناوبـراو غـەدری لێکـراوە و شـوێنەکەی بەجـێ هێشـتووە، هەرچـی زووە چـاو بـە کارەکـەی بخشـێنرێتەوە و بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، هەروەهـا نـووسراوی تایبەتـی بـاش کیتابەتـی شـکۆداری مابەینـی هومایۆنـی شـکۆدار ئـاگاداری دەرچـووە و ئاماژە دراوەتـە ویلایەتـی موسـڵی شـکۆداریش، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.



| 22 سەفەر 1312 | 000463.034675 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی شکۆدار
ئـەم ناوانـەی کـە تۆمـار کـراون و زەوی و زار بەڕێوەدەبـەن لـە ناحیـەی کیـل سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك، هیـچ پەیوەندییەکیـان بـە زەوییەکـەوە نییـە، بۆیـە خراوەتـە سـەر ئەملاکـی هومایـۆن، هەروەهـا لـەم حاڵەتـەدا داهاتـی زەوی ناوهاتـوو بـۆ خواردنـی دەرویـش و هەژارانـی تەکیـەی ناحیـەی ناوهاتـوو تەرخـان کـراوە، بـەڵام تەکیـەی ناوهاتـوو کارگێریەکـەی تێـك چـووە، بۆیـە لـە شـێخەکانی قادریـە عەبدولحەمیـد تاڵەبانـی داواکاری بـە واژووی بـەرز کردۆتـەوە کـە لـە تەلەگرافنامـەی کەرکـوك دەرچـووە، داوای کـردووە بدرێتـە ناوبـراو، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.




BEO.000480.035932.001

| BEO | 000480.035932 | 19 ڕەبیعی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
وێنـەی لـە نـووسراوی بـاڵادا نووسراوەتـەوە، فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت ڕاگەیەنـدراوە، بـە گوێـرەی ئەمـە لـە نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك بۆ کۆکردنـەوەی باجی ناحیەکانی کیل و مەلحە پێویسـتی بە کاتیبێکی بـاج و مووچەیە.




BEO.000481.036075.003

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000481.036075</td><td>21 رەبیعی یەکەم 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ پایەی پوەندیدارانی سەدارەتی شکۆدار<br>ئەگـەر ئیسـلام نەبووبـام و خائیـن بووبـام بـێ دەنـگ دەبـووم، بـەڵام لەبـەر داد و ئەمانەتـی شـاهانە دەمـەوێ راسـتییەکان رابگەیەنـم، سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، لـە نەخشـەی عیـراق لـە ویلایەتـی موسـڵ دەرچـووە، لـە دەرەوە و نـاوەوەی ویلایـەت بارودۆخـی سـلێمانی و کەرکـووك تێکچـووە و بەبـێ خـاوەن ماوەتـەوە، دەسـەڵاتی حکوومـەت بـە خراپـی بـەکار دەهێنرێـت، کـەس لـە گیانی خـۆی ئەمیـن نییە، فرمێسـکی خوێـن دەرژێـت، ئەوانەی دەیانەوێـت ئاسـایش بەرقـەرار بێـت، بە خائین لە قەڵەم دەدرێن، پاشـام سـوێند بە ٤٠ موبارەك دەخۆم ئەوەی باسـی دەکـەم راسـتە، بـە تەلەگـراف بینیـت رووداوەکان وا دەکـەن خوێـن برژێـت، بـە نـاوی دادوەری شـاهانە رادەگەیەنم دانیشـتوانی زوڵملێکـراو و حکوومەتیـش لـە پایەوپلەیەکـی فەنایـە، راگەیەنـدراوە و هــەواڵ دراوە فەرمـان.<br>بەندە مەجید</td></tr>
</table>



BEO.000482.036108.003

<table>
<tr><th>BEO</th><th>000482.036108</th><th>3 رەبیعی یەکەم 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ١٩٥١<br>جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>لـە سـانجەقی کەرکـووک، لـە بـارەی کارە خراپەکانـی قائیمقامـی قـەزای کـۆی سـانجەق عەبـاس ئەفەنـدی لـە شـوێن خۆیـدا لـە رێگـەی فەرمانبـەری تایبەتـەوە لێکۆڵینـەوە ئەنجـام دراوە، کاغـەزی لێکۆڵینەوەکانیـش نێـردراوە، نـووسراو لـە ویلایەتـی موسـڵ نێـردراوە و لـە ١٣ کانوونـی دووەم ١٣٠٩ نـووسراو پێشـکەش کـراوە، لەسـەر دووپاتکردنـەوە ئەمجـارە لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو تەلەگرافنامـە لـە ٤ ئۆغسـتۆس ١٣١٠ دەرچـووە، لەگـەڵ هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی بـە هـاوکاری جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>راوێژکاری نەزارەتی ناوەخۆ</td></tr>
</table>



BEO.000485.036332.002

| 24 ڕەبیعی یەکەم 1312 | 000485.036332 | BEO |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتی عالی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
جەنابی جـەلال پاشا موتەسـەرفی سـانجەقی مـوش لەگـەڵ ئاووهـەوای ئـەوێ ناگونجێـت و لەوەتـەی چۆتـە ناوچەکـە چ خـۆی چ خێزانەکـەی لـە نەخۆشـی ڕزگاریـان نەبـووە، ئەگـەر بێتـو ئەرکەکـەی درێـژە بکێشـێت ئـەوا هیـلاك دەبێـت، بـۆ ئـەوەی ئەرکەکـەی بگوازرێتـەوە داوای گواسـتنەوە دەکات، هەروەهـا عـارف پاشا موتەسـەرفی کەرکـووك لـە خانەدانـە لێهاتووەکانـە و دەتوانێـت کارگێـڕی سـانجەقی مـوش بـە لێهاتوویـی بەڕێوەببـات، هـەر خۆشـی هـەردوو سـانجەق لـە ڕووی پلـە و مووچـەوە یەکسـان نیـن، بۆیـە بـۆ ئـەوەی گواسـتنەوەی ئەرکەکانـی جـەلال پاشـا بـۆ کەرکـووك و عـارف پاشـا بـۆ موتەسـەرفی مـوش گونجـاو بێـت پێویسـتە پەیوەندیـداری وەکالـەت بڕیـار بـدات، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ



| 29 رەبیعی یەکەم 1312 | 000486.036393 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار
نەشئەت ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سەرەتایی سانجەقی رۆژهەڵاتی قەرەحیسار بووە و لەبەر هەندێك کردەوەی نابەجێ و سەرپێچییەوە دراوەتە دادگا، هەر کە ئەنجامی دادگا راگەیەندراو بێ تاوانی ساغ بووەوە ئەم کاتە لە شوێنێکی تر دادەمەزرێت، بۆیە بە دوورخستنەوەی لە شوێن ئەو رزا ئەفەندی سەرۆکی سزای دادگای سەرەتایی کەرکووك و بۆ سەرۆکایەتی سزای کەرکووکیش ئەمین ئەفەندی سەرۆکی سزای دادگای سەرەتایی کەربەلا و بۆ سەرۆکایەتی سزای کەربەلاش سەرۆکی دیوانیە مستەفا کامل ئەفەندی و بۆ سەرۆکایەتی سزای دادگای دیوانیەش یاریدەدەری داواکاری گشتی ئەحمەد لوتفی ئەفەندی هەروەها لە یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای ناوهاتووش ئەندامی ئیستینافی دادگای ویلایەتی بەغداد خەلیل فوئاد ئەفەندی سوێندی یاسایی دەخۆن و دەگوازرێنەوە و دادەمەزرێن، لەم بارەیەوە لەسەر راپۆرتی مێژووی ١٣ و ٢٢ رەجەب ١٣١٢ ژمارە ٣٣٣ لە مێژووی ٢٩ رەجەب ١٣١٢ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 15 رەبیعی کۆتایی 1312 | 000495.037120 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لەبـەر ئـەوەی جەنابـی جـەلال پاشـا لەگـەڵ ئاووهـەوای ئـەوێ ناگونجێـت داوای کـردووە ئەرکەکـەی بگوازرێتـەوە، موتەسـەرفی سـانجەقی مـوش، بـۆ ئـەوەی ناوبـراو لەگـەڵ موتەسـەرفی کەرکـووك عـارف پاشـا ئەرکەکەیـان بگۆردرێتـەوە لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٤ رەبیعـی کۆتایـی ١٣١٢ ژمـارە ٢٣٩٥ بـە مۆڵەتـی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت لـە مێـژووی ١٤ رەبیعـی کۆتایـی هەمـان سـاڵ بریـار دراوە، هەردووکیـان ئەرکەکەیـان بگۆردرێتـەوە و ئـاگاداری ناوبـراوان بـە تەلەگرافنامـە بـە ویلایەتـی موسـڵ و بەتلیـس راگەیەنـدراوە. | | |



BEO.000513.038463.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000513.038463</td><td>9 جەمادی یەکەم 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی شكۆدار<br>عەبدولقادر ئەفەندی ئیمامی قۆناغی حكوومەتی سانجەقی كەركووك بە هۆی خراپی بژێوی ژیانی و نەبوونیەوە پێویستی بەوەیە مووچەیەكی بۆ ببڕێتەوە بۆ ئەمەش لە ویلایەتی موسڵ نووسراو نێردراوە، لە نەزارەتی ناوەخۆی شكۆداریش نووسراوی مێژووی ٦ جەمادی یەكەم ١٣١٢ ژمارە ٢٧٩٥ هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی.</td></tr>
</table>



| 27 جەمادی کۆتایی 1312 | 000541.040535 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك لـە خەلیفەکانـی تەریقەتـی نەقشـبەندی نیشـتەجێی شـارۆچکەی کـۆی سـانجەق حاجـی ئەسـعەد ئەفەنـدی شـایەنی بەزەییـە، بـۆ ئـەم زانایـە برێکـی گونجـاو مووچـە دابیـن بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو نێـردراوە، هاوپێـچ نـوسراو لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆداریش هاتـووە، لـە مێـژووی ٥ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٢ بـە نـووسراو ڕەوانـی دەوڵـەت کـراوە، بەهـۆی پێویسـتی بـە هەندێـك ووتـە و داواکاری بەزەییانـە ئەمجـارە لەلایـەن ناوبـراوەوە داواکاری دراوە، هاوپێـچ دراوەتـە سـەروو، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




BEO.000546.040904.002

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000546.040904</td><td>8 رەجەب 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی تۆمار<br>تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵ<br>هەواڵ هاتووە لە ٧ کانوونی یەکەم ١٣١٠ بە فەرمانی پەیوەندیداری وەکالەت ئەم سەربازە شاهانانەی کە رۆیشتوون بێ ئەرزاقن، لەبەر ئەوەی سەربازەکانمان جێگای شانازی ئێمەن، پێویستە دەوڵەت پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکات، هەر خۆشی ئەمانە لە پارەوپولی کەرکووک پارەیان بۆ رێکخراوە، بۆیە هەرچی زووە داهاتیان بۆ دابین بکرێت، لەم بارەیەوە لەسەر ئاگادارکردنەوەیەکی تەواو بە گوێرەی پێویست ئەرزاقیان بۆ دابین کراوە و نێردراوە، ئەمەش لە تەلەگرافنامەی موتەسەرفی کەرکووک لە مێژووی ٢ کانوونی یەکەم ١٣١٠ دەرکەوتووە، ئەمجارەش لە موتەسەرفی ناوهاتوو ئامۆژگاری تایبەتی دەرچووە، هەروەها لە قائیمقامیەتی بازیان لەبارەی جێبەجێ کردنی دادگایی کردنەکە بە بریاری ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت دەستی لەکار کێشاوەتەوە، لە شوێنی ئەو یەکێك بە وەکالەت دامەزراوە و نێردراوە.<br>عەزیز والی</td></tr>
</table>


BEO.000548.041087.001

| 12 رەجەب 1312 | 000548.041087 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار
لەگـەڵ ئـەوەی سـانجەقەکانی موسـڵ و سـلێمانی و کەرکـووك لـە نـاو کارگێـری موفەتیشـی دادی بەغـدادە، کەچـی مـاوەی دوو سـاڵە نەچۆنەتـە ئـەم ناوچانـە و تەنیـا دەچنـە بـەسرا و دەگەڕێنـەوە، هەروەهـا سـانجەقی سـلێمانی بەهـۆی دانیشـتوان و شـوێنی سـتراتیژیەوە خـاوەن شـوێنی خۆیەتـی، بۆیـە جێـگای سـەرنج ڕاکێشـانە، پێویسـتە دادگایەکانـی ڕێـك بخرێـت و مامەڵـەکان بـە باشـی بەڕێـوە ببردرێـن و چاکسـازیان تێـدا بکرێـت، بـۆ ئـەوەی ناوبـراو هەرچـی زووە بچێتـە سـلێمانی لـە نەزارەتـی شـکۆدار فەرمـان بدرێتـە دەسـتی، وێنەیـەك لـە تەلەگرافنامـەی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەم هاوپێـچ لەگـەڵ نـووسراوی لایەنـی واڵای سەرعەسـکەر کـە لـە مێـژووی ١٠ رەجـەب ١٣١٢ ژمـارە ٧٤٣ بەیەکـەوە نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



BEO.000572.042852.002

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000572.042852</td><td>18 شەعبان 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>تەلەگرافنامەی بە شیفرەی ویلایەتی موسڵ هاتووە<br>لە خەڵکی بازیان بەکر بەگ بە هۆی تاوانەوە دەستگیر کراوە، تەلەگرافنامەی ١١ کانوونی دووەم ١٣١٠ لە دواییـن دێـردا بریـار و فەرمـان دەرچـووە، وێنەیەکـی فەرمانـی پەیوەندیـداری سـەدارەتیش بـۆ موتەسـەرفی کەرکـووك نێـردراوە، لـە وەڵام ئـەم تەلەگرافنامەیـەی کـە هاتـووە، ناوبـراو بەهـۆی رووداوەکـەوە بـە دەسـتگیر کردنـی سـەیری چارەسـەرەکەی دەکرێـت، ئەگەرچـی ئاماژەی پێکـراوە، تـا ئێسـتا دەسـت بەسـەر نەکـراوە، هەروەهـا لـەو شـوێنەی کـە خـۆی شـاردۆتەوە دەبێتـە هـۆی ناکۆکـی نێـوان هـۆزەکان، لـە تەلەگرافنامـەی ٦ و ٩ کانوونـی دووەم ١٣١٠ راگەیەنـدراوە، جگـە لـەوە فەرمانـی چوونـی تابورێـك بـۆ ناوچەکـە دەردەچێـت.<br>عەزیز والی</td></tr>
</table>



| 14 رەمەزان 1312 | 000586.043910 | BEO |
|---|---|---|

بۆ بریکاری سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار
نووسراو
غالیـب ئەفەنـدی کـوڕی حاجـی زەینەلـی کەرکووکـی لـە سـاڵی ١٣٠٨ لـە فەرمانگـەی ئەمانـەت فەرمانبـەر بـووە، دوای ئـەوەی ماوەیـەك رسـوماتی ئاڵتـون کۆپـری بەڕێوەبـردووە، رسـومی ناوهاتـوو بـە موزایـدە حەواڵـەی ناوبـراو کـراوە، بـەڵام لەبـەر نەمانـی ١٠٠ هـەزار قـوروش دادگایـی کـراوە، بـۆ رزگار بـوون لـەم حوکمـەی بەسـەریدا دەسـەپێت، بـۆ دەرسـەعادەت رایکـردووە، داواکار محیەددیـن کـە لـە بازرگانەکانـی کەرکووکـە لەگـەڵ هاوەڵـی داواکاری بـە واژوویـان ناردووە، هاوپێـچ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، لـە دادگایـی پێداچوونـەوە ووردبینـی بـۆ کـراوە، لـە لێکۆڵینەوەکانیـش دەرکەوتـووە و روون بۆتـەوە، هـەر ئێسـتا هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



BEO.000586.043936.001

| BEO | 000586.043936 | 20 ڕەمەزان 1312 |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی شکۆدار

داهاتــی ســانجەقی ســلێمانی تەنانــەت بەشــی دەرماڵــەی شــەش مانگــی چــوار تابــوری ســەربازی شــاهانەی ئــەوێ نــاکات، زۆر بــە پێویســت زانــراوە کــە شــەش مانگــی تریــش زیــاد بکرێــت و بخرێتــە ســەری، هەروەهــا لەگــەڵ مەرکــەزی ویلایــەت ســانجەقی کەرکــووك تەنگــژەی دارایــی دروســت بــووە، گەیشــتۆتە پلــەی کۆتایــی، بۆیــە دەرماڵــەی شــەش مانگــی ســەربازی شــاهانە ویلایــەت بــۆ ویلایەتێکــی تــر بگوازرێتــەوە، هەروەهــا بــەم هەژمــار کردنــە چەنــد ١٠٠٠٠٠ قوروشــێك زیــاد دەبێــت و دەگاتــە دەســت، ئــەم تەلەگرافنامــەی لــە ویلایەتــی موســڵ وەرگیــراوە لەگــەڵ نــووسراوی مێــژووی ٢٢ ڕەجــەب ١٣١٢ هەروەهــا بــۆ ڕێکخســتنی کارگێــڕی ســەربازی شــاهانەی ســلێمانی لــە بــارەی قــەرز کردنــی پــارە تەلەگرافنامــە لــە مێــژووی جیــاوازدا هاتــووە ئامــاژەی پێکــراوە، تەلەگرافنامــەی ئەنجوومەنــی کارگێــڕی لیــوای ناوهاتــوو لــە مێــژووی ٣ مــارت ١٣١١ بــۆ دەوڵــەت نێــردراوە، داهاتــی ناوخــۆ لەگــەڵ خەرجــی یەکســان نیــن و جیــاوازی لــە برەکەیانــدا هەیــە، ســاڵانە لــە پلــەی ١٨٠٠٠ لیــرە دەردەکەوێــت، مووچــەی مولکیــە و ســەربازی شــەش مانگــی پێشــوو تەنانــەت مانگــی ڕەمەزانــی شــەریفەش دابیــن نەکــراوە، تەنگــژەی دارایــی گەیشــتۆتە پلەیــەك لەوانەیــە ببێتــە ئەگــەری ســەرهەڵدانی ســەرپێچی و ئــاژاوە، بۆیــە بەپەلــە ٧٠٠٠ تــا ٨٠٠٠ لیــرە حەواڵــە بکرێــت و بگاتــە شــوێنەکە، هەروەهــا بــۆ ڕێکخســتنی کارگێــڕی لیواکــە ئامــادەکاری پێویســت بکرێــت و هەرچــی زووە جێبەجــێ بکرێــت، جگــە لەمــە لەســەر ئامــاژەی پێشــووی ویلایــەت لــە ڕیزبەنــدی تەلەگرافنامەکــە دەردەکەوێــت، جێبەجــێ بکرێــت بەبــێ دواکەوتــن، پەلــەش بکرێــت لــە ڕاگەیاندنــی، هیممــەت بکرێــت لــە ناردنــەوەی تەلەگرافنامەکــە.



| 29 شەوال 1312 | 000607.045501 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی خەزینەی شاهانەی شکۆدار
لـە موڵکـی هومایۆنـی کشـتوکاڵی شـەمامك سـەر بـە قـەزای هەولێـر سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك، یەکێـك لـە ئاغاکانـی عەشـیرەتی دزەیـی ئیبراهیـم ئاغـا و نزیکـەی چـل کـەس لـە خـزم و پاسـەوانەکانی چوونەتـە سـەر فەرمانگـەی موڵکـی هومایـۆن، فەرمانبەرەکانیـان ناچـار کـردووە، کارەکانیـان بـە جـێ بهێڵـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە هـەواڵ نێردراوەتـە سـەرۆکایەتی قۆمیسـیۆن لـە موسـڵ، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە چارەسـەرێك بـۆ ئـەوە بدۆزرێتـەوە، لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگـراف لـە مێـژووی ١٠ شـوبات ١٣١١ لەگـەڵ زانیـاری نێـردراوە، تـا کاری لـە سـەر بکرێـت.



| BEO | 000609.045672 | 2 زیلقەعدە 1312 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی سەر عەسکەری والا و خەزینەی تایبەت
نەزارەتی شاهانەی شکۆدار
لە سانجەقی کەرکووک مولکی کشتوکاڵی هومایۆنی شەمامکی سەر بە قەزای هەولێر، لە ئاغاکانی هۆزی دزەیی ئیبراهیم ئاغا نزیکەی ٤٠ کەس لە هاوەڵانی چوونەتە سەر فەرمانگەی مولکی هومایۆن، فەرمانبەرەکانیان ناچار کردووە، دەست لە کار هەڵگرن، بۆ لێکۆڵینەوە لەم رووداوە سەرۆکایەتی قۆمیسیۆن، مولکی هومایۆنی موسڵ ئاگادار کراوەتەوە، لە سەر ئەو ئاگادارکردنەوەیە لە خەزینەی تایبەت بۆ ئامادەکاری لە مێژووی ٢٩ شەوال ١٣١٢ لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە هاتووە، لەلایەن قۆماندانی پۆلیسی پاراستن عوسمان پاشا لەگەڵ ئەندازیار بینباشی عوسمان ئەفەندی نووسراو نێردراوە، بە گوێرەی ئەمە ناوبراو ئیبراهیم ئاغا و هاووەڵانی لە دەورووبەری مولکی هومایۆنی شەمامك بە مارتینی هانری و نزیکەی ٥٠٠ چەکداری پیادە و سوار رێککەوتوون، بە خۆیان چوونەتە سەر کارگێرخانە، هۆکاری ئەو کارە لە هۆبەی کاتیب چەند جار لە قۆمیسیۆن سکاڵایان تۆمار کردووە، کەچی بەهانایانەوە نەرۆیشتوون، کاتیبی ناوبراو لە کارگێرخانە دەرهێنراوە، لەگەڵ بوونی روسومی مەرومالات لە مولکی هومایۆنی شەمامك ئاغاکان و بەرێوەبەری ناحیەی شەمامك فەرمانبەرانی مولکی هومایۆن لە دامەزراندنی خۆیان یارمەتی دراون، دەبێ ملکەچی خۆیان دەربرن، لەگەڵ ئەمەش بە ناردنی یەکێك، لە لەشکری شەشەمی هومایۆن فەرمان دراوەتە قوماندانی موسڵ بە درەنگ ناردنی سەرباز گرنگی نامێنێت، لە ویلایەتی ناوهاتووش جولە دەکەن، ئەمجارە بە تەلەگرافنامە لایەنی سەر عەسکەری والا ئاگادار کراوەتەوە، هەروەها خەزینەی تایبەتی نەزارەتی شاهانە زانیاری پێ دراوە.



| 11 زیلقەعدە 1312 | 000616.046126 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شکۆدار
هۆیـەی ئەملاکـی هومایۆنـی شـەمامك کـە لـە ناو سـانجەقی کەرکووکـە لە زەوی کشـتوکاڵیە، بـە هێرش کردنە سـەر کارگێـری ئـەم مولکـەی هومایۆنـە هەرەشـەی لـە فەرمانبەرانـی کـردووە و دەریانـی کـردووە، بـۆ ئـەوەی رێگـە لـە سـەرپێچی و مامەڵـەی نەگونجـاوی ئاغاکانـی دزەیـی ئیبراهیـم ئاغـا بگیرێـت، ئـەوا سـەربازانی شـاهانە بـۆ ناوچەکە بـرۆن، بـە گوێـرەی ئاماژەکانـەوە کـە بـە دەوڵـەت دراوە، کەچـی تـا ئێسـتا نەنێـردراون، هەروەهـا لـە قۆمیسـیۆنی ئەملاکـی هومایۆنـی موسـڵ راگەیەنـدراوە ناوبـراو تـا ئێسـتا لـە ناوچەکـەی و لەسـەر کاری سـەرپێچی بەردەوامـە، بۆیـە پەلـە بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، لـە مێـژووی ١٠ زیلقەعـدە ١٣١٢ نـووسراوی عالـی هاتـووە، بـۆ پەرشـوبڵاوکردنی ئـەم کۆمەڵەیـە و دەسـتگیرکردنی تاوانبـاران، بـە قوماندانیەتـی ئاغـای قـول مەفرەزەیـەك سـەرباز رەوان کـراوە، لەگـەڵ ئەمـەش تابورێکـی پیـادە و ٢٠٠ ئێسـتر سـوار رێکخـراو و رەوان کـراوە، بـە تەلەگرافنامەکانـی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن و ویلایەتـی موسـڵی شـکۆدار هاتـووە و راگەیەنـدراوە.



| 21 زیلقەعدە 1312 | 000623.046674 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵ<br>بـۆ هەندێـك پێداویسـتی سـانجەقی کەرکـووك لـە مێـژووی ٢٥ نیسـان ١٣١١ لەلایـەن موتەسـەرفەوە تەلەگرافنامـە نێـردراوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە مامەڵەکـە جێبەجـێ بکرێـت. | | |



| 26 جەمادی یەکەم 1312 | 01318.000012 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٤٧٦
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە راسـتییدا سـەر بـە دەوڵـەتـی عالییـە، ماوەیـەکـی زۆرە لە ئێران نیشـتەجێ بـووە، ئەمجـارە هاتۆتە کەرکووك، شـێخ جـەلال لەگـەڵ عەشـیرەتەکەی بـە ٢٠٠ خانـە داوای مانـەوەی لـە مەمالیکـی شـاهانە کـردووە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـە رەزامەنـدی هیجـرەت کردنیـان و نیشـتەجێ کردنیـان لـە زەوی خاڵـی زەنگولـی سـەر بـە ناحیـەی توزخورماتـوی سـانجەقی کەرکـووك نیشـتەجێ بکرێـن، ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان داواکاری مێـژووی ٢٣ سـەفەر ١٣١٢ دراوەتـە قەڵـەم، لەوێشـەوە دراوەتـە عالـی، شـێخی ناوبـراو ئـەم تایبەتمەندییانـەی کـە داویەتیـە دەوڵـەتـی ئێـران، بەجـێ دەهێڵێـت و وەکـو هاونیشـتیمانیەکی دەوڵـەتـی عوسـمانی بـە هەمـوو مەرجـەکان دەوڵـەت رازی بـووە و تـکای کـردووە، دێتـە نـاو خاکی عوسـمانییەوە، لـە ویلایەتـی موسـڵی شـکۆدار تەلەگرافنامە هاتـووە و لەگـەڵ وێنەی زەبتیـەی راگەیەنـدراو بەیەکـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراو کـرا.
سەدری ئەعزەم




ŞD.02644.00006.001

<table dir="rtl">
<tr><th>ŞD</th><th>02644.00006</th><th>22 جەمادی یەکەم 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دەفتەری خاقانی<br>ئەنجوومەن<br>ژمارە ١٤١<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك گوندەکانـی جلبـور و رۆژبەیانـی و ئاغچـە مەشـهەد بـە موزایـدە جێگیـر دەکرێـت، بـە بـەدەل دەدرێتـە خاوەنەکانیـان، ئەگـەر بێتـو قەبولیـان نەکـرد، دەدرێتـە ئـەم کەسـانەی کـە بـەم شـێوەیە قەبوڵـی دەکـەن یاخـود بـە بڕیـاری ئەنجوومەنـی کارگێـری لیـوا بـە هەمـان بـەدەل دەدرێتـە دانیشـتوان، بـۆ مۆڵـەت وەرگرتـن نـووسراوی مێـژووی ٦ مـارت ١٣١٠ پێشـکەش کـراوە، بـەڵام تـا ئێسـتا وەڵام نەهاتۆتـەوە، هەروەهـا ئەمجـارە لـە بەڕێوەبەرایەتـی دەفتەرخاقانـی بەغـداد دووپاتکراوەتـەوە و بـۆ ئـەوەی پێشکەشـی پەیوەندیدارانـی سـەدارەت بکرێـت، لـە نەزارەتـی ئەنجوومـەن باسـکراوە، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>نازری دەفتەرخاقانی</td></tr>
</table>



İ.PT 5/32
2


<table>
<tr><td>İ.PT</td><td>00005.00032</td><td>8 شەوال 1313</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٢٣٧٨<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە نێوان کەرکووك و کۆی سانجەق بۆ گواستنەوەی ئەمانەت و نموونە پۆستەچیەکی ئاسایی بەڵێندراو مانگانە بە ٢٥٠ قوروش دابین بکرێت، بە زانیاری حکوومەتی خۆچێی پۆستەچییەکی خولاوە بەم برە پارەیە رێك بخرێت و بۆ ئەمەش راگەیاندنی نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی بەهیە حەواڵەی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بووە و مەزبەتەی فەرمانگەی ناوەخۆی شورای دەوڵەتیش راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



İ.TKS 5/38

İ.TKS.00005.00038.004

| İ.TKS | 00005.00038 | 2 زیلقەعدە 1313 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٦٢١
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك جەنابـی جـەلال پاشـا بەهـۆی مـاوەی ئـەم خزمەتـەی کـە کردوویەتـی جگـە لەمـە بـۆ رۆژێکیـش هەڵـەی نەبـووە، بۆیـە سـێیەکی دوا مووچـەی ٢٥٠٠ و دوا مووچـەی قائیمقامـی پێشـووی قـەزای ئەدرنـە حوسـێن حوسـنی ئەفەنـدی نیـوەی مووچەکـە ٨٧٥ و قائیمقامـی پێشـووی قـەزای یەنیبـازار عەلـی نـازم ئەفەنـدی دوا مووچـەی سـێیەکی ٨٣٣ قـوروش بـە پشـت بەسـتن بـە بریارنامـەی مووچـەی دوورخراوانـی فەرمانبەرانـی مولکیـە ناوبـراوان مووچـەی دوورخراوانیـان بـۆ دابیـن دەکرێـت، بـۆ ئەمـەش حەواڵـەی نەزارەتـی سـندوقی خانەنشـینی مولکیـەی شـکۆدار کـرا، ئـەم مەزبەتانـەی لـە فەرمانگـەی تەنزیماتـی شـورای دەوڵـەت دراوەتـە قەڵـەم راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـرا، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم



| 6 ڕەبیعی کۆتایی 1313 | 00016.00029 | İ.AZN |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٧٧٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
یاریدەدەرەکانی داواکاری دادگای سەرەتایی سانجەقەکانی ڕۆژهەڵاتی قەرەحیسار و کەرکووك شوێنیان بەتاڵە، بۆ یاریدەدەری ڕۆژهەڵاتی قەرەحیسار یاریدەدەری داواکاری دادگای سەرەتایی پێشووی سانجەقی ئورفە ئیبراهیم ئەفەندی و بۆ یاریدەدەری کەرکووکیش یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی عەکای پێشوو نازم ئەفەندی دامەزرێن، بۆ ئەمەش بڕیاری سوێندخواردنیان لەسەر جێبەجێ کردنە، سەبارەت بە دامەزراندنیشیان مەزبەتە لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی داد ڕێکخراوە و ئەوراقی ڕوون کردنەوە نێردراوە، بە ڕاگەیاندن و پێشکەش کردنی ڕاپۆرتی نەزارەتی داد و مەزهەبەکانی شکۆدار لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم





| I.ML | 000016.000033 | 9 رەجەب 1313 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
١٦٤١
لـە سـاڵی ١٣٠٠ تـا کۆتایـی سـاڵی ١٣٠٢ بـۆ سـەربازی شـاهانەی قـەزای هەولێـر پێداویسـتی گواسـتراوەتەوە شـارۆچکەی کەرکـووك، بـۆ ئـەم مەبەسـتە تێچـووی گواسـتنەوەی ئـەو پێداویسـتیانە ١٨٥٧٠ قـوروش ٣٤ پـارە دراوە، لەبـەر ئـەوەی تێچـووی گواسـتنەوەکە زۆرە، ڕەزامەنـدی لـە سـەر خـەرج کردنـی پارەکـە نـەدراوە، ئـەو پـارە دیاریکـراوە کـە پەیوەسـتە بـە تێچـووی سـاڵی ١٣٠٢ لـە موازەنـەی ئـەو سـاڵە نووسراوەتـەوە، بۆیـە نێردراوەتـە نەزارەتـی دارایـی لەگـەڵ داواکاری فەرمانگـەی ناوەخـۆی شـورایی دەوڵـەت پێشـکەش کـراوە.
سەدری ئەعزەم

| I.ML | 000016.000033 | 13 جەمادی کۆتایی 1313 |
|---|---|---|

نووسراوی نەزارەتی دارایی شورایی دەوڵەت ٢٣ جەمادی یەکەم ١٣١٣ ژمارە ١٢٢ حەواڵە کراوە و لە فەرمانگەی ناوەخۆ خوێندنەوەی بۆ کراوە
لـە سـاڵی ١٣٠٠ تـا کۆتایـی سـاڵی ١٣٠٢ بـۆ سـەربازی شـاهانە لـە قـەزای هەولێـر پێداویسـتی گواسـتراوەتەوە بـۆ شـارۆچکەی کەرکـووك، بـۆ ئـەم مەبەسـتە تێچـووی گواسـتنەوەی ئـەو پێداویسـتیانە ١٨٥٧٠ قـوروش ٣٤ پـارە دراوە، لەبـەر ئـەوەی تێچـووی گواسـتنەوەکە زۆرە، ڕەزامەنـدی لەسـەر خـەرج کردنـی پارەکـە نـەدراوە، ئـەو پـارە دیاریکـراوە، لـە سـەنەدی تایبـەت ڕەزامەنـدی لـە سـەر نـەدراوە، بۆیـە لـە ویلایەتـی موسـڵ لـە دەفتـەردار پرسـیار کـراوە، بـە پێـی ڕێنماییـەکان ئـەو پێداویسـتیانەی کـە لـە شـوێنی خۆیـدا بـە سـەربازەکان دەدرێـت، ئەگـەر بێتـو کەموکـوری تێـدا بـوو، بـە کراوەیـی دەمێنێتـەوە بـە شـێوەی قەرەبووکردنـەوە بـە پـارەی ئاقچـە لـە موازەنـەی سـاڵی ١٣٠٢ بدرێـت، بریـار و فەرمـان بـۆ ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
سەرۆکی فەرمانگەی ناوەخۆ و ئەندامەکانی

تلغراف نامه



DH.ŞFR.00192.00117.001

| DH.ŞFR | 00192.00117 | 27 زيلحيجه 1313 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بەهـۆی شـوێنی گرنـگ و سـتراتیژی سـانجەقی کەرکـووك پێویسـتە موتەسـەرفەکەی کەسـێکی لێهاتـوو بێـت و لـە پایەکـەی بەهێـز بێـت، لـە تەلەگرافنامـەی ڕۆژانـی ڕابـردوو ئامـاژەی پێکـراوە چەندیـن سـاڵە کارگێریەکـەی بـە خراپـی بەڕێوەدەچێـت و لاوازە، بۆیـە بـۆ لیـوای ناوهاتـوو موتەسـەرفی ئەماسـیا بەکـر پاشـا کەسـێکی گونجـاوە، بـۆ دامەزراندنـی ناوبـراو گۆڕینـەوە بـە ئەرکەکانیـان بکرێـت، تـکا دەکرێـت فەرمـان دەربچێـت.
قوماندان و والی موسڵ فەریق عەبدوڵڵا



ŞD.00361.00048.001

| ŞD | 00361.00048 | 13 موحەررەم 1313 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی کاروباری دارایی
ژمێریاری گشتی
ژمارە ٥٣٨
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
ناحیەکانی مەلحە و کیل سەر بە سانجەقی کەرکوک لە یەکتر دوورن و مامەڵەی باج و تۆمار زۆرە، بۆ هەردوو ناحیە مانگانە بە مووچەی ٣٠٠ قوروش و بە زانیاری کاتیبێك بەرێوە نابردرێت، بۆ ئەم مەبەستە بۆ هەر یەکە بە مووچەی ١٥٠ قوروش دوو کاتیب بۆ هەردوو ناحیەکە دادەمەزرێت، بەم ڕاگەیەندراوە بە دەفتەرداری ویلایەتی موسڵ ڕاگەیەندراوە کە ٣٠٠ قوروش ٢٠٠ قوروشی دەخرێتە سەر، حاڵی حازریش لە ناوچەکان دوو نەفەر بوونی هەیە و بە شێوەیەکی کاتی بەکاردەهێنرێن، بۆ بڕی ٢٠٠ قوروشەکەش کە دەخرێتە سەر ٣٠٠ قوروشەکە لە موازەنەی گشتی فرقەی خولاوە ساڵی ١٣١١ تۆمار دەکرێت، لەگەڵ ڕەزامەندی پاشا و ئەم کەنارەی لە نووسراوی کارگێری گشتی باج نووسراوەتەوە بە بڕیاری ئەنجوومەنی دارایی لە ژمێریاری گشتی دارایی گفتوگۆی لەسەر کراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری دارایی




ŞD.00364.00012.001

| ŞD | 00364.00012 | 7 جەمادی کۆتایی 1313 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
رسوماتی دە یەك
ژمارە ١٢١٦
بەندەتان
لـە پاشـکۆ و کەسـوکاری ئـەم فەرمانبـەرەٍ هەڵبژێردراوانـەی بـۆ هەژمارکردنـی سـەرمەڕی سـانجەقی کەرکـووك دامـەزراون، لـە پایـەی ویلایەتـی موسـڵی بەهیـە راگەیەنـدراوە، لەسـەر ئـەم راگەیەنـدراوە فەرمانبـەران بـە پێچەوانـەی رێنماییـەکان دامـەزراون، لـە بـارەی فەرمانبەرانـی خۆچێـی لێکۆڵینـەوەی سـەرەتایی دەسـتی پێکـردووە، لـە وەڵامـدا نـووسراوی مێـژووی ٣١ ئۆغسـتۆس ١٣١١ هاتـووە، ئەوانـەی بـۆ هەژمارکردنـی سـەرمەڕی کەرکـووك هەڵبژێـردراون، نیـزام قەدەغـەی نزیکایەتـی کـردووە، بـە نـووسراو نووسراوەتـەوە، جگـە لەمـە لـە وەرزی هەژمارکـردن رۆیشـتوون، دوای مۆڵـەت ئـەم ووتەیـە نەبێتـە دژایەتـی کردنـی نیزامـی هەڵبـژاردن، لەسـەر ئامـۆژگاری ئەنجوومەنـی دەسـتەی کارگێـری لیـوا و مامەڵـەی راسـتەقینە، پێویسـتە سـزای پێویسـت ئەنجـام بدرێـت، ئەمـەش لـە راوێـژکاری یاسـایی خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە و بـە بریـاری ئەنجوومەنـی دارایـی دەیـەك و رسـومات لـە کارگێـری گشـتی باسـکراوە، هەروەهـا لـە بـارەی ئامـۆژگاری پێویسـت لەلایـەن بەنـدەوە بـە ویلایـەت راگەیەنـدراوە، سـەبارەت بـە سـزای پەیوەندیدارانـی وەکالەتیـش فەرمـان دراوەتـە ویلایـەت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری دارایی




| 8 موحەررەم 1313 | 00391.00075 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
لە بنەچەی پێغەمبەر سەید ئەحمەد ئەفەندی و قائیمقام لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی ئەرکەکەی بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەبات، کەچی کەسێك بە ناوی حەفید شێخ مستەفا ئەفەندی خۆی وەکو قائیمقام ناساندووە و پێچەوانەی نیزام لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوا لەگەڵ چینی ئەندامانی ئاسایی کار دەکات، هەروەها لە نێوان سەیدەکاندا دووبەرەکی و شەڕ دروست دەبێت، بۆیە لەلایەن سەید و شێخەکاندا بە مۆر و واژووی جۆراوجۆر داواکاری وەرگیراوە، دوای لێکۆڵینەوە کارەکە جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت.




DH.MKT.00392.00094.005

| DH.MKT | 00392.00094 | 12 سەفەر 1313 |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار

لــە ســانجەقی کەرکــووك کارگێــڕی قــەزای رانیــە لــە حاڵەتێکــی زۆر شــپرزە و شــلەژاوە، خەڵکەکــەی کــە لــە هۆزگەرایەتــی پێــك هاتــوون، زۆربەیــان کۆچیــان کــردووە بــۆ ئێــران، بەشێکیشــی لەســەر ســنوور نیشــتەجێ بوونــە، هەروەهــا لــە نێــوان ئەوانــەی لــە نــاو قــەزای ناوهاتــوودان رووبەرووبوونــەوە رووی داوە، بــۆ چاکســازی کارگێــڕی قەزاکــە و ڕێگــە نــەدان لــە ڕوودانــی ڕووبەڕووبوونــەوە لــە نێــوان هــۆزەکان بــە مــۆری ئەمیــن نــووسراو دراوەتــە جەنابــی ســەدری ئەعزەمــی پەیوەندیــداری ســەدارەت، بــە گفتوگــۆ لەلایــەن والــی پێشــووی موســڵ جەنابــی تاهیــر پاشــا نــووسراو وەرگیــراوە، وێنــەی دەرچــووی هاوپێــچ پێشــکەش کــراوە، بــە تێروانیــن لــە بابەتەکــە لێکۆڵینــەوە جێبەجــێ بکرێــت و ئەنجامەکــەی رابگەیەندرێــت.



| 14 موحەررەم 1313 | 00394.00015 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
بەڕێوەبــەری تەحریراتــی ســانجەقی کەرکــووك عەبدولرەحــمان ئەفەنــدی بەهــۆی کارە باشــەکانی پلــەی چــوارەم لەگــەڵ پارچەیــەك نیشــانی مەجیــدی پــێ بدرێــت، بــۆ ئــەم مەبەســتەش لــە ویلایەتــی موســڵی شــکۆدار نــووسراوی مێــژووی ٢٣ مــارت ١٣١١ لەگــەڵ هاوپێــچ و تۆمــار بەیەکــەوە پێشــکەش کــراوە.



| 8 موحەررەم 1313 | 00396.00004 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتی عالی<br>قەڵەمـی تەحریراتـی سـانجەقی کەرکـووك عەلـی نەزمەددیـن بـەگ وەکـو کاتیبـی فەخـری پلەکـەی بـۆ پلـەی چـوار بـەرز بکرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی ٥ مایـس ١٣١١ لەگەڵ هاوپێچ پێشـکەش کـراوە. | | |



DH.MKT.00438.00018.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>00438.00018</td><td>16 رەجەب 1313</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ ویلایەتەکانی دیاربەکر و موسڵ و مەعمورەتولعەزیزە و سیواس لەگەڵ موتەسەرفی ساسون لە شێخەکانی تەریقەتی مەولەوی سانجەقی کەرکووك، رەشادەتلو حەیدەر بۆ ئەوەی ئەمجارە لە دەرسەعادەت بگەڕێتەوە، نیازی خۆی روون کردۆتەوە، ئەم داواکاریەی کە کردوویەتی ئاسانکاری بۆ بکرێت.</td></tr>
</table>




BEO.000649.048640.003

| BEO | 000649.0486401 | 11 موحەڕڕەم 1313 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>وێنـەی ئـەو تەلەگرافنامەیـە کـە لـە ویلایەتـی موسـڵ بـۆ نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار نێـردراوە لـە سـەرۆکایەتی گشـتی حکوومەتـی خـوی و سـەلماس و سـاوچبۆلاق شـازادە موعیـن ئەلدەولـە دامـەزراوە، ناوبـراو هاتۆتـە سـاوچیۆلاق دواتریـش دەچێتـە ئورمیـە، هەروەهـا لـە هۆزەکانـی ئێـران سـەرۆکی هـۆزی مامـش میـری ئـاڵا محەمـەد ئاغـا لەگـەڵ ئاغـای هـۆزی کـوڕەك خـضر ئاغـا و ئاغـای هـۆزی مەنکـور بـەردەوام ناکۆکـی و شـەڕ هەیـە، بـۆ ئـارام کردنەوەیـان ئەندامـی چەکـداری هـۆزی لەگـەڵ خـۆی بـردووە و بـۆ لای مەنکـور ڕۆیشـتوون، لـە نـاو سـانجەقی کەرکووکیـش بـۆ پاراسـتنی سـنووری قـەزای ڕانیـە ئامـادەکاری بکرێـت و حاکیمـی سەردەشـت لەلایـەن سـلێمان ئاغـا سـەرۆکی هـۆزی نوردەدینـی پشـدەر سـەر بـە سـانجەقی سلێمانی دەرکـراوە، ئێسـتاش بـە رووکـەش هیـچ جموجوڵێکـی سـەربازانی ئێـران نابینرێـت، بـەڵام کۆبوونـەوەی ئەوانـە لـە ٥٠٠٠ کـەس زیـاد نـاکات، بێگومـان تـا هاتنـی وەرزی زسـتان نیشـتەجێ دەبـن، بۆیـە پێویسـتە سـنوور بـە تەواوەتـی بپارێزرێـت، لـە شـەهبەندەری سـاوچبۆلاق ئامـاژەی پێکـراوە، لـەم حاڵەتـەدا بـە پێویسـت زانـراوە سـەرباز بوونـی هەبێـت، بـە ئامـاژەی قائیمقامـی رواندز تەلەگرافنامـە لـە موتەسـەرفی کەرکـووك وەرگیـراوە، تێیـدا نووسراوەتـەوە، لـەم بابەتـەدا ئـەو زانیاریانـەی دەسـت دەکـەون بـە ئامـاژەی پەرشـوبڵاو ڕاگەیەنـدراوە.<br>عەزیز | | |



| BEO | 000692.051874 | 23 ڕەبیعی کۆتایی 1313 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار
یاریدەدەری دادگای سەرەتایی سانجەقی ڕۆژهەڵاتی قەرەحیسار بێ فەرمانبەرە، بۆیە یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی پێشووی سانجەقی ئورفە ئیبراهیم ئەفەندی و بۆ یاریدەدەری سانجەقی کەرکووك یاریدەدەری داواکاری گشتی پێشووی سانجەقی عەکا نازم ئەفەندی فەرمانی سوێند خواردنیان لەسەر جێبەجێ کردنە، بۆ دامەزراندنیان لەسەر نووسراوی مێژووی ١٦ ڕەبیعی یەکەم ١٣١٣ ژمارە ٣٨٥ و بە ڕەزامەندی پەیوەندیداری خەلافەت لە مێژووی ٢٠ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٣ فەرمانی پاشا دەرچووە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.000702.052616.003

| 17 جەمادی یەکەم 1313 | 000702.052616 | BEO |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ۲۷۲۷<br>بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، جەنابی عالی<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>جەنابی ئەنیس پاشا وەکو والی ویلایەتی دیاربەکر دامەزراوە، بۆیە لە موتەسەرفی سانجەقی ماردین کەسێکی گونجاو هەڵبژێردرێت و ماوەی ساڵێکە موتەسەرفیەتی ماردین بە وەکالەت بەرێوە دەبردرێت، بەم تێروانینەوە بە گوێرەی کات پەلە بکرێت موتەسەرفێك بۆ ناوچەکە رەوان بکرێت، هەروەها موتەسەرفی پێشووی کەرکووك جەنابی جەلال پاشا لەم کەسانەیە کە هەموو سیفەتەکانی تێدا بەدی دەکرێت، بۆ موتەسەرفیەتی ماردین گونجاوە، ئەم کاغەزانەی کە بۆ ئەم مەبەستە رێکخراوە و روون کراوەتەوە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ دەست بەکاربوونی ناوبراو لە موتەسەرفیەتی ماردین لەسەر رای پەیوەندیداری سەدارەت وەستاوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ | | |



| 9 رەجەب 1313 | 000722.054076 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی سەر عەسکەری والا
٢١ شـەعبان ١٣١٢ ژمـارە ١٤١٠ لەسـەر نـووسراوی سـیپاهیداری عالـی وەڵامـی ئـەو ئاماژەیـەی کـە پێشـوو نێـردراوە، لـە نەزارەتـی دارایـی بەهیـە هاتـووە، هاوپێـچ ئـەو نـووسراوەی لـە مێـژووی ٢١ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٣ بـۆ سـەروو نێـردراوە، لـە پاشـکۆی سـانجەقی کەرکـووک لـە نێـوان هۆزەکانـی قـەزای رانیـە رووبەرووبوونـەوە روویـداوە، لەبـەر ئـەم هـۆکارەوە دە یەکـی ئـەم سـاڵە داوا نەکـراوە، بەهـۆی ئـەم بارودۆخـە بەڕێوەبردنـی داهـات هەڵدەوەشـێتەوە، بۆیـە پێشـنیار دەکرێـت دە یەکـی باسـکراو لەسـەر رێـژەی دوو سـاڵ بـۆ دانیشـتوان بدرێـت، بـۆ گۆرینـی ئـاگاداری دراوەتـە خۆچێـی، لەسـەر بارودۆخـی ئـەم ناوچەیـە لـە پێشـنیاری بـە بەرامبـەر و پاشـماوەکانی سـەربازی شـاهانە بـۆ ناحیەکانـی شـێروان و مـزوری دەروات و کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت، لـە سەرعەسـکەری عالـی خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە ئەگـەر بێتـو پێویسـت بـکات دووبـارە بکرێتـەوە، لەسـەر نـووسرا و ئامـاژەی ناوهاتـوو هیممـەت بکرێـت لـە ناردنـەوەی.



| BEO | 000760.056944 | 8 شەوال 1313 |
|---|---|---|

جەنابی ئەفەندم
بــۆ گواســتنەوەی ئەمانــەت و کەلوپــەل لــە نێــوان کەرکــووك لەگــەڵ کــۆی ســانجەق مەکاتیبــی گواســتنەوە دابیــن بکرێــت بــۆ ئەمــەش مانگانــە ٢٥٠ قــوروش بدرێــت، بــە ئــاگاداری حکوومەتــی خۆچێــی پۆســتەچیەکانی پۆســتە بــە کەفالــەت بــە بــری دیاریکــراوی پــارە ڕێــك بخرێــت، بــە مەبەســتی خــەرج کردنیشــی ڕاگەیاندنــی نەزارەتــی پۆســتە و تەلەگرافــی بەهیــە حەواڵــەی نەزارەتــی ناوەخــۆی شــکۆدار کــراوە، بڕیارنامــەی فەرمانگــەی ناوەخــۆی شــورای دەوڵــەت ڕاگەیەنــدراوە و پێشــکەش کــراوە، لــەم بابەتــە جەنابــی پەیوەندیــداری خەلافــەت چ بفەرمووێــت، جێبەجــێ دەکرێــت، بــە ڕاگەیاندنــی نــووسراو کــراوە ئەفەنــدم.
ڕەفعەت سەدری ئەعزەم



| 16 زیلقەعدە 1313 | 000772.057861 | BEO |
|---|---|---|

نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
بەهـۆی هـەژاری و زۆری منـداڵ سـەرەتا ١٠٠ قـوروش مووچـەی بـۆ براوەتـەوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی بەشـی بژێـوی ژیانی ناکات، داوای کردووە بۆی زیاد بکرێت، لە سـانجەقی کەرکوک دانیشـتوی کۆی سـانجەق فاروق زادە محەمەد لامع لەگـەڵ واژوو و مـۆری ناوبـراو داواکاری هاوپێـچ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، هیممـەت بکرێت لە جێبەجـێ کردنی.




| BEO | 000784.058776 | 14 زیلحیجە 1313 |
| --- | --- | --- |

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر نووسراو
لە نێوان عەشیرەتەکانی زەند و تاڵەبانی سەر بە سانجەقی کەرکووك رووبەرووبوونەوە روویداوە، بۆ ئەوەی ئەم رووبەرووبوونەوەیە هێور بکرێتەوە، سەربازی شاهانە نێردراوە، لەلایەن ئەم سەربازانەوە دوو شێخی تاڵەبانی دەستگیر کراوە، لەم دوو شێخە یەکێکیان هەڵاتووە و لەم گوندەی کە خۆی حەشارداوە، بوێری ئەوەی کردووە چەك لە بەرامبەر سەربازی شاهانە بەکار بهێنێت، لە ئەنجامدا لە سەربازانی شاهانە ٣ نەفەر بریندار بووە، لە دانیشتوانیش ٤ کەس کوژراوە، هەروەها دانیشتوانی گوندەکەش شوێنی خۆیان بەجێ هێشتووە و بۆ ئێران هەڵاتوون، جگە لەمە بۆ سوتاندنی گوندی دیدار ٥٠ تا ٦٠ کەس کۆبوونەتەوە، بۆ ئەم مەبەستە مەفرەزەیەك بۆ گوندی ناوهاتوو بڕوات و بۆ ئەوەی رێگە نەدرێت دانیشتوانەکەی بۆ ئێران بڕۆن، ئامادەکاری بکرێت و تەلەگرافنامە لە والی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوهاتووی ٥ زیلحیجە ١٣١٣ ژمارە ٩٨٠ بەیەکەوە بۆ سیپاهیداری عالی نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە هەرچی زووە لە کاروباری سەربازی و ئەرکەوە کاری پێویست ئەنجام بدرێت.



| ŞD | 01105.00050 | 16 شەوال 1313 |
|---|---|---|

فەرمانگەی خانەنشینی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٣٣٣
لەلایەن موتەسەرفی پێشووی کەرکووک جەنابی جەلال پاشا داواکاری دابین کردنی مووچەی دوورخراوانی کردووە، بە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، ئەوراقی لەم بارە لەگەڵ خشتەی دەستە ووردبینی بۆ کرا. ئەوراقی هاوپێچ لەگەڵ خشتە بە تێروتەسەل نیشانی داوە، ئەرکی ناوبراو گەیشتۆتە ٢٢ ساڵ، لە بارەی ناوبراویشەوە مەمنون نییە، موتەسەرفی سلێمانی کارەکەی بە لێهاتووی ئەنجام داوە، لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە بگوازرێتەوە بۆ کەرکووک، بە لابردنی لە کارەکەی ئەوراقی ناوبراو و تۆمارەکانی نیشانی داوە بە پشت بەستن بە بریارنامەی دوورخراوانی فەرمانبەرانی مولکیە بە ماددەی ٨، سێیەکی دوا مووچەی ٢٥٠٠ قوروش ماددەی ٦ی بریارنامە مامەڵەکە جێبەجێ دەکرێت، جەنابی پاشا بە فەرمانی پاشا مێژووی دوورخراوان رێك دەخات، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.


İ.DH.01328

| 11 جەمادی یەکەم 1313 | 01328.000024 | I.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٠٦٩
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
جەنابی جـەلال پاشا موتەسـەرفی کەرکـووك بـە گونجـاو نازانرێـت لـە ئەرکەکـەی بـەردەوام بێـت، لەسـەر ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ دووربخرێتـەوە لـە شـوێن ئـەو موتەسـەرفی سـانجەقی سـلێمانی جەنابـی عەبدولرەحـمان پاشا دابنرێـت و بـۆ موتەسـەرفیەتی سـلێمانیش موتەسـەرفی سـانجەقی چـورم سـاڵح پاشـا ئەرکەکانیـان بگوازرێتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار لـە ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان دراوەتـە قەڵـەم، لەگـەڵ بریارنامـە بـە هاوپێچـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا هـەر چۆنێـك بێـت پەیوەندیدارانـی خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت بـە راگەیاندنـی نـووسراو نووسراویـەوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم



| 27 زیلقەعدە 1313 | 01334.000028 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٩٠٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
میـری ئـاڵای رەفعـەت بـەگ قومانـدان و موتەسـەرفی سـانجەقی خەمـس لـە مامەڵـەی یاسـایی هیـچ جموجۆڵێکـی نییـە، بۆیـە دوور خراوەتـەوە و دەنێردرێتـە مەرکـەزی لیـوای ناوهاتـوو لـە ئەرکـی قوماندانیەتـی وەکـو بینباشـی سـەربازی ئەرکەکـەی ئەنجـام دەدات، هەرچـی موتەسـەرفیەتە ئـەوا جەنابـی جـەلال پاشـا کـە لـە موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك جیابۆتـەوە، ئـەم ئەرکـەی پـێ بدرێـت، بـۆ ئەمـەش لـە ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان مەزبەتـە دراوەتـە قەڵـەم لەگـەڵ هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرموویـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم



| 1313 زیلحیجه 7 | 01334.000030 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣٠٢١
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بە پێویست زانراوە بۆیە موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك جەنابی عەبدولرەحمان پاشا دوور خراوەتەوە، بۆ موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو موتەسەرفی سانجەقی رۆژهەڵاتی قەرەحیسار حەقی ئەفەندی دابنرێت، بۆ شوێنی ئەویش مەکتوبچی ویلایەتی جەزائیر بەحری سەفید جەنابی رائف ئەفەندی دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەسەر نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار مەزبەتە دراوەتە قەڵەمی ئەنجوومەنی تایبەتی بریکارەکان هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم



| 24 زیلحیجه 1314 | 00021.00002 | İ.AS |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣٦١٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ سـکاڵا لەسـەر ئاغـای تابـووری سـانجەقی کەرکـووك ئیسـماعیل بـەگ بەرزکراوەتـەوە، ئەگەرچـی دەسـتی لـە کارەکـەی کێشـاوەتەوە، بـەڵام لەبـەر گرنگـی شـوێنی لیـوای ناوهاتـوو گونجـاو نییـە ئاغـای تابـوور بـە وەکالـەت بەڕێـوە ببردرێـت، لەگـەڵ ئـەم روون کردنـەوەی کـە کـراوە هـەر کـە ئەنجامـی لێکۆڵینـەوەکان دەرچـوون و روون بـووە بێتاوانـە، ئـەم کاتـە لـە ویلایەتـی بـەسرا لەگـەڵ ئاغـای تابـووری دووەمـی عەمـارەی ئـاڵای زەبتیـە حەسـەن ئاغـا گۆڕینەوەیـان پـێ بکرێـت، بـۆ ئەمـەش مەزبەتـەی فەرمانگـەی ژاندارمـە رێکخـراوە و هاوپێـچ نـووسراوی سـەر عەسـکەر بەیەکـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم



| Y.PRK.UM | 00036.00030 | 6 جەمادی کۆتایی 1314 |
|---|---|---|

لەشکری یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
لە موسڵەوە شیفرە
قائیمقامی پشدەر بیتباشی حوسنی و قوماندانی تابور سەعید ئەفەندی لە فرقەی قوماندانی دوانزەمین ئاگادار کراوەتەوە، لەگەڵ تەلەگرافنامەی مێژووی ٢٤ تشرینی یەکەم ١٣١٢ لەگەڵ تێروانین لە تەلەگرافنامەی موتەسەرفی سلێمانی بە مێژووی ٢٥ تشرینی یەکەم ١٣١٢ بە پێی جموجۆڵی سەربازی ئەو دواییە، بۆ ئێران هەڵاتووە، لەوێش پارێزگاری لێ کراوە، لایەنگری ئێران و لە سەر سنووری عوسمانی ئاغاکانی پشدەر لە ناحیەی ئالان نیشتەجێ کراون، دانیشتووانی ناحیەی ناوبراو لەگەڵ عەشیرەتی پشدەر بە بەیەکگرتنیان، نزیکەی ١٥٠٠ کۆمەڵ لە تشرینی یەکەم رۆژی ٢٣ لە رێگای گوندی بێستانە لە ناحیەی پشدەر هۆزی ئۆجاق نیشتەجێن و تووشی هەڕەشە بوونەتەوە و گوندەکەیان سووتێنراوە و ماڵیان تاڵان کراوە، لە مەرکەزی قەڵای دیزە هێزی سەربازی لە سەر هاتن، بەڵام لەگەڵ مەفرەزەیەکی ١٠٠ کەسی ناوبراو حوسنی ئەفەندی چاودێری کراوە، لەگەڵ سەرهەڵدانی دوو رووبەڕووبوونەوە، لە سەربازی شاهانە ٢ شەهید و ٤ بریندار هەیە، هەروەها لە چەتەکانیش دوو کوڕی سەلیم ئاغا لەگەڵ کەسانی ناو عەشیرەتەکە کوژرا و بریندار هەیە، هەروەها ئەو هێزەی کە بوونی هەیە، بە پێی پێویست نییە، تووشی ئابڵوقە بۆتەوە، بە پەلە یەك تابور بنێردرێت، گرنگی کارەکە و پەلەیی پێویستە، لەگەڵ ١٢٠ پیادە و مەفرەزەی ٣٠ سوارەی ئێستر لە کۆی سەنجاق بۆ ناوچەی دیاریکراو بنێردرێت، بۆ ئەم مەبەستە بۆ قوماندان نووسراوە، لە کەرکووکیش مەفرەزەیەك بە ٦٠ سەربازی ئەمرۆ جولە دەکەن. بەم شێوەیە لەگەڵ ئەوەی هێشتا لە رووی پارێزگارییەوە ناتەواوە، لە سەر فەرمانی پاشای پەیوەندیداری خەلافەت لە سلێمانی یەك تابور سەربازی شاهانە دەنێردرێت، لە ژێر پاراستنی ئەو سەربازانە، بەیەکەوە، بە پەلە ئاسایشی پشدەر بگەڕێندرێتەوە دۆخی جارانی، بۆ ئەم مەبەستە مەفرەزە لە کۆی سەنجاق و کەرکووك نێردراوە، جگە لەوەش بە پەلە یەك تابور لە سلێمانی نێردراوەتە پشدەر، بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکان بە رێکوپێکی و پارێزگاری کردن لە شوێنەکە میری ئاڵای رزا بەگ لە کارگێری بە توانایە و ئیسلامە، لە ژێر قوماندانی ناوبراو ماوەیەك لەم ناوچەیە دەمێنێتەوە، یارمەتی دانی ئەرکی ئێمەیە.
والی موسڵ و وەکیلی قوماندان ڕەفیق



DH.ŞFR.00209.00119.001

| 23 شەوال 1314 | 00209.00119 | DH.ŞFR |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لـە ١٤ و ١٥ مـارت ١٣١٣ تەلەگرافنامـەی بەندەمـان راگەیەنـدرا، لـە شـارۆچکەی کـۆی سـانجەق ئـەو رووداوەی کـە تێـدا روویـدا، هۆکارەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ بەڕێوەبردنـی خراپـی قائیمقامـی قـەزا عەبدولرەحـمان بـەگ، لەگـەڵ ئەمـەش لەسـەر ئـەو ئامادەکاریانـەی کـە کـراوە، دوکانـەکان کراوەتـەوە و هـەر کـەس سـەرقاڵی کاری خۆیەتـی و دەسـتی بـە کاری خـۆی کـردووە، قائیمقامـی ناوهاتـوو گوێرایەڵـی ئـەو ئامۆژگاریـە دووبارانـە نابێـت کـە بـەردەوام پێـی دەدرێـت، فەرمانبـەری لێکۆڵینـەوە نێردراوەتـە شـوێنەکە و مەترسـی بابەتەکـەی روون کردۆتـەوە، جێـگای مەترسـیە دووبـارە رەوان بکرێتـەوە، گەندەڵـی لـە بـەردەوام بـوون دایـە، هەرچـی زووە بـە موتەسـەرفی کەرکـووك راگەیەنـدراوە کـە بەپەلـە ناوبـراو دووربخرێتـەوە و کەسـێکی تـر بکرێتـە قائیمقامـی کـۆی سـانجەق، بـۆ ئەمـەش هـەر ئێسـتا قائیمقامـی سـەڵاحیە ئەمیـن ئەفەنـدی بگوازرێتـەوە قـەزای کـۆی سـانجەق و لـە قائیمقامیـەت دامەزرێـت، هەروەهـا بـە پەلـە بچێتـە شـوێنەکە و ئاسایشـی قـەزای کـۆی سـانجەق جێگیـر بـکات و ئـەو ئاژاوەیـە کۆتایـی پـێ بهێنرێـت و ئەوانـەی هـۆکاری ئـەو رووداوەن و کـە ناوەکانیـان دیـارە دەسـتگیر بکرێـن و رەوانـەی مەرکـەزی لیـوا بکرێـن، بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئـەم کارانـەش ئـاگاداری دراوەتـە خۆچێـی، بـۆ قـەزای سـەڵاحیەش کەسـێکی ئاوێتـە بـە هۆزگەرایەتـی و کەسـێکی گونجـاو دابمەزرێـت. | | |



| 1 ڕەبیعی یەکەم 1314 | 000823.061708 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>لەبـەر خراپـی بارودۆخیـەوە لـە داهاتـی کەرکـووك ٤٠٠ قـوروش مووچـە دابیـن بکرێـت و پێـی بدرێـت، لەلایـەن حافیـزی کوێـر محەمـەد سـەعید داواکاری مێـژووی ٢٣ موحـەرڕەم ١٣١٤ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، لەسـەر داواکاری ناوبـراو و هەندێـك ووتـەوە ئەمجـارە ناوبـراو دیسـان داواکاری بـەرز کردۆتـەوە و بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە ئامـاژەی پێشـوو هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |


OSMANLI ARŞİVİ
BEO

BEO.000853.063957.001

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO</td><td>000853.063957</td><td>11 جەمادی یەکەم 1314</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>سەبارەت بە برینەوەی مووچە بۆ یەکێك لە سەیدەکانی سانجەقی کەرکووك بە ناوی حاجی عومەر ئەفەندی لە وەکالەتی ویلایەتی موسڵ نووسراو و مەزبەتە بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوهاتوو لە مێژووی ٨ جەمادی یەکەم ١٣١٤ ژمارە ٢٩٩٣ بەیەکەوە هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردرا، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.</td></tr>
</table>



| 29 رەجەب 1314 | 000890.066719 | BEO |
|---|---|---|

بۆ جەنابی دادی شکۆداری، لایەنی عالی
لــە ســانجەقی کەرکــووك و دەوروبــەری شــەقامی بەغــداد نیشــتەجێیە و محەمــەد خورشــید ســەرۆکی داودە و هاوەڵانــی لــە عەشــیرەتی ئوســویلی نزیکــەی ٣٠٠ تــا ٤٠٠ کەســیان کۆکردۆتــەوە و خەریکــی تێکدانــی ئەمنیەتــی ڕێگاکانــن، ئەمجــارە ناردنــی هێــزی ســەربازی گونجــاو نابێــت، لــە بەڕێوەبەرایەتــی توزخورماتــو لــە ســەرۆکەکانی ئــەم عەشــیرەتە بــە ناوی ئیســماعیل بــەگ بەڵێنــی داوە تاڵانکــراوەکان بگەڕێنێتــەوە و ڕادەســتی بکاتەوە و ئاسایشــی ڕێــگاکان بپارێزێــت، بۆیــە دامەزراندنــی ناوبــراو بــە مەرجــی مانــەوەی داواکاری مافــی کەســێتی و گەرانــەوەی کەلوپەلــی تاڵانکــراو و ڕادەســت کردنەوەیــان هەروەهــا بەهــۆی تاوانەکانیــان مافــی گشــتی دەبوردرێــن، لەســەر تەلەگرافنامــەی ویلایەتــی موســڵ جەنابــی پەیوەندیــداری خەلافــەت بــە فەرمانــی پاشــا ڕەزامەنــدی دراوە، لــە وەڵامــدا ئــاگاداری دراوەتــە ویلایەتــی ناوهاتــوو بــۆ جێبەجــێ کردنــی کارەکــە، لــە مابەینــی هومایۆنــی بــاش کیتابەتــی شــکۆدار بــە نــووسراوی تایبــەت بــە نەزارەتــی ناوەخــۆی شــکۆدار ڕاگەیەنــدراوە و زانیــاری درا.



| 16 شەوال 1314 | 02080.00053 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ١٢ كانوونـی دووەم ١٣١٢ ژمـارە ١٣٠ عالییـە، لـە نـاو سـانجەقی كەركـووك كاتیبـی پێشـووی ناحیـەی داقـوق ئەمیـن ئەفەنـدی ئـەم زەخیرەیـەی كـە خراوەتـە سـەر ئەسـتۆی بـە مەبەسـتی چۆنیەتـی دەسـتكەوتنی وێنـەی هەشـت یەكـی ئـەم زەخیرەیـە لەلایـەن موتەسـەرفی پێشـوو جەنابـی جـەلال پاشـا روون كراوەتـەوە، لەگـەڵ یەكـەم هەنـگاو ئامـاژە بـە بـری هەشـت یەكـی زەخیـرەكان كـراوە.




İ.ML.00023.00022.005

| 23 ڕەبیعی كۆتایی 1315 | 00023.00022 | İ.ML |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆن ئێستا
١١٣٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ ژمێریـاری سـانجەقی كەركـووك عوسـمان ئەفەنـدی پێچەوانـەی فەرمـان و نیـزام هەندێـك كـردەوە ئەنجـام دەدات، وەكـو سـەرەتایەك لـە ئەنجـام دانـی ئەركەكـەی قەدەغـە كـراوە و دراوەتـە دادگا، بـەڵام تـا ئەنجامـی دادگا دەردەچێـت گونجـاو نییـە ژمێریاریەكـە بـە وەكالـەت بەرێوەبچێـت، بۆیـە بەپەلـە دادگایەكـەی كۆتایـی پـێ بێـت و لـە كاتـی دەرچوونـی بێتاوانـی لە شـوێنێكی تـر دابمەزرێـت، هەروەها بـۆ ژمێریاری ناوهاتـووش ژمێریـاری پێشـووی مونتەفیـك ڕەفعـەت ئەفەنـدی دابمەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـووسراوی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولكیـە لەگـەڵ داواكاری نەزارەتـی دارایـی شـكۆدار بەیەكـەوە پێشـكەش كـراوە و ڕاگەیەنـدراوە، لـەم بابەتـەدا پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ فەرمانێـك بـدات جێبەجـێ دەكرێـت.
سەدری ئەعزەم



| 30 جەمادی یەکەم 1315 | 00023.00059 | İ.ML |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٥٣٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە مووچەی دوورخراوان ٢٠٠٠ قوروش کە لە خەزینەی شکۆدار دابین کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناتوانی بنەماڵەکەی پێ بەڕێوە ببات بەهۆی زۆری بنەماڵەکەی، لە بارەی زیاد کردنی مووچەکەی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووک روشدی پاشا داواکاری پێشکەش کردووە، بۆ چۆنیەتی کارەکە ئاماژە دراوەتە نەزارەتی دارایی شکۆدار و بۆ ناوبراو لە دارایی سانجەقی برۆسە لە مووچەی ١٨٠٠ قوروش دوای دابین کردنی لە مووچەی ماوەش کە ٥٠٠ قوروشە بخرێتە سەری دەکاتە ٢٣٠٠ قوروش بۆی دابین بکرێت، نووسراو لە نەزارەتی ناوهاتوو هاتووە، راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم




İ.ML.00026.00059.005

| İ.ML | 00026.00059 | 15 زیلقەعدە 1315 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٣١٩٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ژمێریـاری سـانجەقی کەرکـووك بـە کراوەیـی ماوەتـەوە، ژمێریارەکـەی دوورخراوەتـەوە و دراوەتـە دادگا، ئەمجـارە بـە وەرگرتنـی پاکانـە لـە بـارەی دامەزراندنـی عوسـمان ئەفەنـدی نـووسراوی نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار لەگـەڵ داواکاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە بەیەکـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم




Y.A.RES.00087.00001.001

| Y.A.RES | 00087.00001 | 1 موحەررەم 1315 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی لەلایـەن عەشـیرەتی جۆراوجـۆرەوە ڕێگـری لـە کاروانـی بازرگانـی دەکرێـت و بـۆ ڕێگەگرتـن لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی ئەمانـە بـە قوماندانیەتـی میـری ئـاڵای ڕزا بـەگ هێزێکـی سـەربازی ڕەوان بکرێـت مەرکـەزی ویلایەتـی موسـڵیش بگوازرێتـەوە کەرکـووك، جگـە لەمـە قائیمقامێـك بـۆ قـەزای سـەڵاحیە دابمەزرێـت، بـە ئاماژەی قوماندانـی ویلایەتـی موسـڵ لـە موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن ڕاگەیەنـدراوە، لەسـەر ئـەم نـووسراوەی کـە لـە لایەنـی سەرعەسـکەرەوە دەرچـووە، ئەنجامـی نـووسراوەکان لەگـەڵ مەزبەتـەی ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان دراوەتـە قەڵـەم، هاوپێـچ بەیەکـەوە ڕاگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم



| 27 سەفەر 1315 | 00473.00011 | ŞD |
|---|---|---|

بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار

هـەروەك چـۆن باوباپیرانـم تـا گیـان فیداکـردن بـۆ چاکسـازی عیـراق کاریـان کـردووە، بەندەشـتان ٣٠ سـاڵە بـە دڵسـۆزی لـە ویلایەتـی موسـڵ ئەرکەکانـم جێبەجـێ کـردووە، بـە تایبەتـی بـە فەرمانـی پاشـا لـە خاکـی ئێـران لـە ئاشـت کردنـەوەی هۆزەکانـی عەمادییـە کارم کـردووە، بەهـۆی ئـەو خزمەتانـەی ئەنجامـم داوە، لـە قۆمیسـیۆن کارەکانـم پەسـەند کـراوە و بـۆ بـەرز نرخاندنـی نیشـانم پـێ دراوە، لـە پلـەی میـری میرانـی نیشـانی مەجیـدی عوسـمانی خەریکـە ئامـادەکاری دەکرێـت بـۆ ئـەوەی پێشکەشـم بکرێـت، بـەڵام لەلایـەن هەندێـك لـە کەسـانی بـێ کەڵـك و کـە رەسـەنایەتیان نییـە و پێیـان قەبـوڵ ناکرێـت، بیرۆکـەی رابـردوو بـە بـێ ئـەوەی لێکۆڵینـەوە و ووردبینـی بـۆ بکـەن بەسـەرم دادەسـەپێنن، بۆیـە بـە سـتەملێکراوی لـە هەولێـر جیابوومەتـەوە، لـە مێـژووی جیاجیـا بانـگ کـراوم، تـا ئێسـتا هیـچ بەرهەمێکـی نەبیـنراوە، بەندەیەکـی وەکـو مـن لـە کوردسـتان لـە یەکـەم خانەدانەکانـە. لـە رێـگای پاراسـتنی سـنوور و دوورخسـتنەوەی ململانێـی هـۆزەکان گیانـم فیـدا کـردووە، دڵسـۆزیم شـایەتی ئـەوە دەدات. لـە نزیـك شـوێنەکەی خـۆم لـە دووەم چینـی قائیمقامیـەت لـە ئەرکەکـەم بەقـەت زەرەیـەك خـاوەم وەرنەگرتـووە، بۆیـە هیـچ یاسـایەك رێگـە نـادات ئەرکەکـەم بـە هـەدەر بچێـت، ئـەوەی ئاشـنای تایبەتمەنـدی مـن بێـت داخـی بـۆ مـن خواسـتووە، تەنانـەت سـتەملێکراویم بـەم دواییـە بـە بابـەت لـە ویلایەتـی ناوبـراو دیـاری کـراوە و بـە وەکالەتـی موتەسـەرفی سـلێمانی دواتـر گواسـتنەوەی ئەرکەکـەم بـۆ کەرکـووك بـە کـۆی گشـتی دڵسـۆزیم دیـارە، هەروەهـا لـە ئەرکـی پێشـووم لـە قائیمقامیەتـی هەولێـر بـە پێـی نیـزام دووبـارە هەمـان کار یاخـود لـە شـوێنێکی تـر لـە کارێکـی گونجـاو کـە شـایەنی رەسـانایەتی مـن بێـت پێـم بدرێـت، بـۆ ئەنجامـی سـتەم لێکراوییەکـەم، ئەمجـارە داوای دادوەری دەکـەم.

قائیمقامی پێشووی هەولێر عەبدوڵڵا



| 7 رەبیعی کۆتایی 1315 | 001004.075268 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك جەنابـی جەمیـل پاشـا تـا ئـەم کاتـەی بـە گوێـرەی لێهاتووەکـەی لـە ئەرکێکـی گونجـاو دادەمەزرێـت، مووچەیەکـی دوورخراوانـی بـۆ ببرێتـەوە، لەگـەڵ دوورخستنەوەشـی لـە شـوێن ئـەو جەنابی بەهـرام پاشـا موتەسـەرفی سـەعرد لە سـەر نـووسراوی مێـژووی ٢٣ سـەفەر ١٣١٥ ژمـارە ١٧٤٦ بە بڕیاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، هەروەهـا مەزبەتـەی قۆمیسـیۆن هاوپێـچ وێنەیەکـی بـۆ واڵا نێـردراوە و هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.



BEO.001120.083942.001

| 1315 زیلحیجە 15 | 001120.083942 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>ژمێریاری سانجەقی کەرکووك بە کراوەیی ماوەتەوە و ناوبراویش لە ژمێریاری دوورخراوەتەوە و دراوەتە دادگا، دوای بێتاوان بوونی عوسمان ئەفەندی بۆ دامەزراندنی لەسەر نووسراوی مێژووی ٦ زیلقەعدە ١٣١٥ ژمارە ١٣٣ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمان پاشا لە مێژووی ٨ زیلحیجە ١٣١٥ رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |


İ.DH.01349

| İ.DH | 01349.000061 | 17 رەبیعی یەکەم 1315 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٧٥٢
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
موتەسەرفی سانجەقی کەرکووک جەنابی جەمیل پاشا بەهۆی بێ توانایی و لێنەهاتوویی لە ئیدارەکردندا بە گوێرەی لێهاتووەکەی لە ئەرکێك دابنرێت و دابمەزرێت، تا ئەم کاتەش مووچەی دوورخراوانی بۆ بڕێتەوە، بە ئاماژەی دوورخستنەوەی لە ئەرکەکەی، لە شوێن ئەو موتەسەرفی سەعرد جەنابی بەهرام پاشا دابمەزرێت کە لەگەڵ والی بەتلیس نێوانی باش نییە و دژی یەکترن بەم شێوەیەش مانەوەی لە ئەرکەکەی گونجاو نییە، بۆ ئەمەش نووسراو کراوە، مەزبەتەش لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە ڕێکخراوە، لەگەڵ نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم




İ.ML.00030.00015.002

<table>
<tr><td>İ.ML</td><td>00030.00015</td><td>12 شەعبان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">
بابی عالی<br>
فەرمانگەی سەدارەت<br>
دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>
٢٤٨٩<br>
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>
لەمەوپێش سلێمان بەگ بەڕێوەبەری تەلەگرافی کەرکووك بووە، دوای ئەوەی ئەرکەکەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی تەلەگرافی دیاربەکر گواستۆتەوە، ٩٦٠٠ قوروش قەرزاری سندوقی دارایی شارەزوورە، کەچی سەنەدی ئەم قەرزە دیار نییە، ئەمڕۆش لەبارەی مان و نەمانی ناوبراو هەروەها ئاخۆ لە ئەرکەکەی بەردەوامە یاخود بەردەوام نییە هیچ زانیاریەکمان نییە، لەبەر ئەوەی کات تێدەپەڕێت بە یاسا وەرگرتنەوەی قەرزەکە هیچ بە یاسایی نەماوە، لە بارەی تەرقین قەید کردنی نووسراو حەواڵەی نەزارەتی دارایی بەهیە کراوە، داواکاریش لە فەرمانگەی دارایی شورای دەوڵەت دراوەتە قەڵەم، ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بریار و فەرمانی چی بێت جێبەجێ دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کرا ئەفەندم.<br>
سەدری ئەعزەم
</td></tr>
</table>


خزینۀ خاصۀ شاهانه

OSMANLI ARŞİVİ
ML.EEM
105 | 38

ML.EEM.00105.00038.001

| 28 جەمادی کۆتایی 1316 | 00103.00065 | **ML.EEM** |
|---|---|---|

خەزینەی تایبەتی شاهانە
فەرمانگەی هومایۆنی قەڵەمەکان
ژمارە ٤٢٢٦
بە عەتەبەی عالیە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، هەروەها لە خودی عالی دەست بەسەر کراوە، نووسراوی ئەم بابەتە لە قۆمیسیۆن ڕاگەیەندراوە، لە پاشکۆی ویلایەتی موسڵ قەزای کەرکووک سەر بە سانجەقی شارەزور زەوی بە ناوی تەرجیل ٢٠ بەشی بۆ خاوەنە، سەنەدی ١٦ بەشی لەلایەن عالیەوە دەست بەسەرە و بۆ ئەو تەرخان کراوە.
سەنەداتی فەرمانبەر



Y.PRK.ASK.00147.00014.001

| Y.PRK.ASK | 00147.00014 | 26 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەری
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی
تەلەگرافنامـە لـە موشـیرەتی شـکۆداری لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن هاتـووە، ئـەو تابـورەی لـە چەمچەماڵـە ئەرزاقـی سـەربازی و کەلوپەلـی دانیشـتووان بگەیەنـن، ئـەو مەفرەزەیـەی لەگـەڵ ئـەو کاروانـە بـۆ سـلێمانی ڕۆیشـتووە، لـە دووری دوو کاتژمێـر لـە کەرکـووك لەلایـەن هـۆزی شـوان کـە زیاتر لـە ٣٠٠ پیـادە و سـوارە چەتەیەك هێرشـیان کراوەتـە سـەر و دوای بـەردەوام بوونـی پێنـج کاتژمێـر شـەر لەگـەڵ ئـەو مەفـرەزە سـەربازیە بەشـێك لـەم ئەرزاقـە سـەربازی و بەشـێك لـە کاروانەکـە لەنـاو چـوون، ئـەو بەشـەی لـە کاروانەکـە ماوەتـەوە لەگـەڵ مەفرەزەکـە بـۆ گونـدی چیمـەن ڕۆیشـتوون، هەروەهـا لـە سـەربازی شـاهانە یـەك سـەرباز شـەهید بـووە و دوو کەسـیش برینـدار بـوون و یـەك چاوشـیش وونـە، لەوانـی تریـش ١٠ کـەس برینـدارە، لـە بەرامبـەر ئـەوەش لـە کەرکـووك ١٠٥ و لـە چەمچەمـاڵ مەفرەزەیەکـی ٦٠ پیـادە دیسـان لـە چەمچەمـاڵ ٤٥ پۆلیـس نێـردراون، لـە ئەنجام رادەگەیەندرێـت، لـە قوماندانیەتـی فرقـەی ١٢ بـە تەلەگرافنامـە ئامـاژەی پێکـراوە، هـۆزی شـوان لـە مەملەکەتـی خۆیـان شـەر دەکـەن، هەروەهـا هـۆزی شـوان هۆزێکـی گـەورەن، تـا دوا ئامـاژە مەفـرەزە نەچۆتـە نـاو شـوانەکان، لـە ئەنجـام پێویسـتە زوو زانیاریـەکان رابگەیەندرێـن، لـە وەڵامـدا قوماندانیەتـی ناوبـراو ئـاگادار کراوەتـەوە، نـووسراو نوسراوەتـەوە و زانیـاری دراوەتـە بابـی عالـی و زانیاریـەکان دەسـت کەوتـووە، چۆنیەتـی جێبەجـێ کردنـی کارەکـەش پەلـەی لـێ بکرێـت، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەر عەسکەر




| Y.A.HUS | 00392.00071 | 24 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٣٤١

بەهۆی خراپی کارگێری فەرمانبەرانی مولکیەی سانجەقی کەرکووك عەشیرەتەکان سوود لە نەبوونی ئامادەکاری و خراپی کارگێریەکەی وەردەگرن و چەندین ناکۆکی کەوتۆتە نێوان عەشیرەتەکانەوە، لەلایەن فەرمانبەرانی ناوهاتووەوەش بە چاوی کێشە سەیری بابەتەکە ناکەن، نووسراو لە والای سەرعەسکەر هاتووە و بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار کراوە، بە پێویست زانراوە کێشە و ناکۆکی نێوان ئەم عەشیرەتانە نەهێڵدرێت و نەهێشتنی کوشتن و هێورکردنەوەی بارودۆخەکە نووسراو بۆ نەزارەتی ناوهاتوو کراوە تا والیەك بۆ ویلایەتی موسڵ دابمەزرێت، ئەم نووسراوە لەگەڵ هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان هەر چییەك بێت جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم




BEO.001170.087718.002

| BEO | 0001170.087718 | 15 رەبیعی یەکەم 1316 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ١٨٦٤
جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندە
خشتەی ساڵی ٣١٠ ی تەمموز و ئۆغستۆسی ویلایەتی موسڵ بە ناردنی هەژماری قائیمقامی رانیە محەمەد سەبری ئەفەندی و قائیمقامی شەهربازار محەمەد شەوقی ئەفەندی خەرجی رێگایان هەیە و تۆمار کراوە، ٤٣٢٠ خەرجی هاتن و رۆیشتنی بە تەواوەتی لەلایەنی حکوومەت رێکخراوە، بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا بۆ دەرسەعادەت هێنراوە، لە مابەینی هومایۆنی ملوکانەی باش کیتابەتی شکۆدار بە شوێن خۆی راگەیەندراوە، محەمەد سەعید ئەفەندی نەوەی کاکە شێخ ئەحمەد ئەفەندی لەم ساڵەدا خشتەی مارت و نیسان و مایس نێردراوە ئەو هەژمارەی تۆمار کراوە ١٣٢٤٩ هەروەها شێخی ناوبراو لە سلێمانی تا کەرکووك وەکو کرێی ئاژەڵەکانی ساڵی ٣١١ کانوونی دووەم ئەو هەژمارەی کە نێردراوە و تۆمار کراوە ٢١٤ قوروش بە کۆکراوەیی ٧٧٨٣ قوروش لە موازەنەی ساڵەکاندا شوێنگرەوەی نییە، بە گفتوگۆ بە خۆچێی راگەیەندراوە، هەروەها ساڵی ٣١٠ و ٣١١ خەرجی رێگا و ئەوانەی رێکخراوە دوای دابین کردنی هیچی نەماوەتەوە، لەم پارە باسکراوانەدا لە ١٧٥٦٩ قوروشدا، ٣١٠ و ٢١٤ قوروش لە موازەنەی ساڵی ٣١١ لە بەشی مەرکەزدا لە بەشی رۆژانەی میوانەکان تۆمار کراوە، ئەوەی ماوەتەوە جێبەجێ کردنی هەژمارەکەی بە ووتەی نەزارەتی ژمێریاری مۆڵەت دراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ



| 1316 شەعبان 8 | 001246.093409 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە فەرمانبەرانـی مولکیـەی سـانجەقی کەرکـووك بەهـۆی بەڕێوەبردنـی کارگێریەکـی خـراپ و سـوود وەرنەگرتـن لـە ئامادەکاریـەکان، لـە نێـوان عەشـیرەتەکان تاقمێـك ئـاژاوە دروسـت بـووە و بەردەوامـە، هەروەهـا ئەمانـەش لەلایـەن فەرمانبەرانـی ناوبـراو بـە چـاوی تۆمارنەکـراو سـەیر دەکرێـت، نـووسراوی سـەر عەسـکەر لـە مێـژووی ٦ شـەعبان ١٣١٦ ژمـارە ١٧٢٤ نێـردراوە و بـە ئامـاژەی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی شـکۆدار لێکۆڵینـەوە لـە بابەتەکـە دەکرێـت و رادەگەیەندرێـت، هیممـەت بکرێـت لـە ناردنـەوەی هاوپێـچ.



| 3 رەمەزان 1316 | 001257.094207 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

ئـەو تابـورەی لـە چەمچەماڵـە لەگـەڵ ئەرزاقـی سـەربازی بەرێکـراون، ئـەو کاروانـەی کـە کەلوپەلـی خەڵکـی هەڵگرتـووە لەگـەڵ مەفرەزەکـە ڕۆیشـتوون، لـە دووری دوو کاتژمێـر لـە کەرکـووك هـۆزی شـوان زیاتـر لـە ٣٠٠ ئەسـپ سـوار و پیـادە وەکـو چەتـە هێرشـیان کـردووە، لەگـەڵ مەفـرەزەی سـەربازی مـاوەی پێنـج کاتژمێـر شـەریان کـردووە، دواتـر ئەرزاقـی سـەربازی و بەشـێکی کاروانەکـە لەنـاو چـوون لەبەرامبـەر ئـەوەدا لـە کەرکـووك و چەمچەمـاڵ لـە هـەر یەکـە مەفرەزەیـەك لەگـەڵ ٤٥ پۆلیـس هاتـوون، لـە قوماندانیەتـی خۆچێـی ڕاگەیەنـدراوە، ئەگـەری ئـەوە هەیـە ئەوانـەی بوێـری ئـەو کارەیـان کـردووە گەراونەتـەوە مەملەکەتـی خۆیـان، هەروەهـا وەڵام هاتـووە لەسـەر بوێـری هـۆزی شـوان تـا دوا ئامـاژە کـە دەرچـووە، مەفـرەزە نەچۆتـە نـاو شـوان، موشـیرەتی لەشـکری شەشـەم ئامـاژەی پێکـردووە، نـووسراوی مێـژووی ٢٨ شـەعبان ١٣١٦ ژمـارە ١٨١٢ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، لـە سـەر عەسـکەر پرسـی لەسـەر کـراوە، بـە تێروانیـن لـەم پرسـە هیممـەت بکرێـت تـا خوێندنـەوەی بـۆ بکرێـت و بەپەلـە ڕەوان بکرێتـەوە.



BEO.001265.094869.002

<table dir="rtl">
<tr><td>BEO</td><td>001265.094869</td><td>29 رەمەزان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>لـە قـەزای گولعەنبـەری سـلێمانی، سـەربازی شـاهانە مووچـەی رەمەزانیـان وەرنەگرتـووە، بۆیـە هێرشـیان کردۆتـە سـەر خانـەی ئەفسـەر و قائیمقـام و لـە مەرکـەزی سـلێمانیش پۆلیسـی پاراسـتن بـە گشـتی هێرشـیان کردۆتـە سـەر فەرمانگـەی حکوومـەت و موتەسـەرفیەت، تاقمێـك مامەڵـەی سـووکایەتیان ئەنجـام داوە، ئێسـتا بریارنامـەی بـە تەلەگـراف لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری سـلێمانی وەرگیـراوە، تێیـدا رایدەگەیەنێـت مووچـەی مانگـی رەمـەزان و جەژنیـان پـێ بدرێـت، هەروەهـا بـە تێروانیـن لـە پاراسـتنی حکوومـەت لـە هەژمـاری باجـی مەڕوماڵاتـی سـاڵی داهاتـوو ئاقچـە قـەرز بکرێـت و کارگێـری سـەربازی جێگیـر بکرێـت، لـە بـارەی قەرزەکـەش لـە سـانجەقی کەرکـووك داوای ئـەرزاق کـراوە، بۆیـە لـە کاتـی جێبەجـێ کردنـی هـاوکاری سـەدارەتی شـکۆدار پێویسـتە، تـکا دەکرێـت کارەکـەی سـانجەقی سـلێمانیش جێبەجـێ بکرێـت، فەرمـان.<br>بە ناوی والی موسڵ یاریدەدەر حەمدی</td></tr>
</table>

| DH.MKT | 02131.00022 | 24 جەمادی کۆتایی 1316 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
لە ویلایەتی موسڵ ئەو دانەوێڵەی ئەم ساڵە دێت، بە گوێرەی پێویستی زەخیرە هەژمار کراوە و داواکراوە، سێ ئەوەندە لە ١٠٠ هەزار قیەدا ٦٠٠ هەزار قیە گەنم بۆ ویلایەتەکانی دیاربەکر و مەعمورەتولعەزیزە، هەروەها ٣٠٠ هەزار قیە جۆ لە ویلایەتی بەغداد یەکسەر بفرۆشرێت، جگە لەوەی پێش ئەوەی وەرزی کشتوکاڵ بەسەر بچێت، بگاتە موسڵ، لەو ناوچانەی شوێن گرەوەکان دەفرۆشرێت پارەکانیان بدرێت، ئەو بریارانەی لە ئەنجومەنی تایبەتی دێت لەگەڵ نووسراوی سەدری ئەعزەم کە دێت، نووسراو بکرێت.
لە لایەنی هەولێریش ئەگەر ئەو زەخیرەی بە کۆمەڵێك ئەسپ دەگوازرێتەوە، دوای پەیدا کردنی، بریار و فەرمان دراوە تا لەوێوە رێگەچارەیەك بۆ گواستنەوەی بدۆزرێتەوە، لە چۆنیەتیشی بە تەلەگراف، ویلایەتی ناوبراو ئاگادار کراوەتەوە، هەروەها ئەو وەڵامەی لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار وەرگیراوە، بری زەخیرەی داواکراو بە رەچاوکردنی خەزینەی شکۆدار، بە گوێرەی توانا پێداویستی کشتوکاڵ بە شێوەیەکی یەکسان دابەش بکرێت، لەوە برێکی کەمتر دابەش بکرێت، بە گوێرەی پر کردنەوەی پێداویستی نابێت، لە ویلایەتی ناوهاتوو لە ٩٠٠ هەزار قیە زەخیرە رێکخراوە، جگە لەوەش ١٠٠ هەزار قیە جۆی تریش رێك خراوە، پێویستی ناردنی نیشان دراوە، لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار تەلەگرافنامە وەرگیراوە، هێشتا ویلایەت پێویستی لەوە زیاترە، بۆیە دەبێ زەخیرە لە موسڵەوە بێت، هەر خۆشی ساڵی رابردوو کەموکوریەکانی لە موسڵ و لایەنەکانی تر لەو زەخیرانەی کە هاتووە پێویستی پر کراوەتەوە، هەروەها ئەم ساڵە لەم شوێنانە هەروەك دیارە زەخیرە نەهاتووە، لە لایەنەکانی تر هۆزەکانی غەزە و شەمەر لەگەڵ ئەو هۆزانەی کە بەستراونەتەوە بە ویلایەت بەیەکەوە زەخیرە دەفرۆشن، ئەو زەخیرانەی کە دێنە ئەوێ نرخی زەخیرەکان بە پارەیەکی زیاتر دەفرۆشن، هەروەها ئەو زەخیرانەی کە لە دەرەوەی وولات لە وولاتی بێگانەوە دێت، لە گومرگ خۆش بن، تا خەڵك سوودی لێ وەربگرن. جگە لەوە ئەو زەخیرانەی کە لە ناو ویلایەت بوونیان هەیە و لە دەرەوە نەهاتوون، دەرکەوتووە بەش ناکات، بۆیە بری نرخەکەی لەسەر خەڵك گران دەبێت و نرخی زەخیرەکان بەرز دەبێتەوە، لەم بارەیەوە ئەو زەخیرەی بۆ ویلایەتی موسڵ دابینکراوە، دەرکەوتووە لە فرۆشتن و ناردنی لە دەرەوەی توانای ئەو دایە، ئەو زەخیرەش شتێکی ئاوا نییە، ئەوەی پێك هاتووە لە ٣٠٠ هەزار قیە جۆ، خەڵکی موسڵیش لە رووی زەخیرەوە تووشی کێشە بوونە و ئەوەش باش نییە، بۆ چارەسەرکردنی و ناردنی زەخیرە، پێویستە ئامادەکاری بە پەلە ئەنجام بدرێت، ئەم زانیاریانەش بۆ ویلایەتی بەغدادی شکۆدار نووسراوە، لەم بارەشەوە هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، بەڵام هێنانی زەخیرە لە خاکی ئێران دێت ئاسایی بووە، کەچی ناردنە دەرەوەی بە هەموو شێوەیەك قەدەغەکرا، بۆ رێزگرتن لە راگەیەندراوی باڵیۆزی تەهران، لە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار ئاگادارکردنەوە هاتووە، لەبەر ئەو هۆکارانە ئەگەر لە نێوچەوانی زەخیرەوە تووشی بێزاری بێت و نەبێت، لەکاتی پرسین ئەو وەڵامەی کە لە ویلایەتی بەغدادی شکۆدار دێت، هەموو ساڵ ئەوەی دەدرێتە موسڵ ئەو زەخیرانەی لەم لایەنانەوە دێت، ئەو زەخیرانەش کە قەدەغەکراون دیار و ئاشکران، لە قەدەغەکراوەکانی ناو ویلایەت بۆ نموونە زەخیرەی خورما قەدەغەکراوە بنێردرێت، بۆ سوود وەرگرتن لە نرخەکەی لەلایەن بازرگانەکانەوە بهێنرێت، ئەو زەخیرانەی لە لایەنی هیندستان لە رێگەی بەسراوە دێن، بە گوێرەی پێداویستی دانیشتووان تا چەند پێویستیان پێیەتی بەم رادەیە لە رەسمی گومرگ خۆش بن، ئەم کارەش پێویستە، بۆیە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش راگەیاندن نێردراوە، هەروەها لە ویلایەتی موسڵی شکۆدار ئەو تەلەگرافنامەیەی کە هاتووە، ئەم ساڵە بەردەوام دەبێت ئەو دانەوێڵەی قورغ دەکرێت و دەستی بەسەر دادەگیرێت کاریگەریەکانی بەسەر سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی بە شێوەیەکی گشتی دەبێت، ئەگەر بێتو قەدەغەکراوەکانی سەر ئێران بەردەوام بێت، ئەو زەخیرانەی لە سنووری ئێرانەوە دێنە ناو قەزاکانەوە بوەستێت، ئەوا پێداویستیەکان زۆر زیاد دەکەن، هەروەها لە مەرکەزی سانجەق بۆ پرکردنەوەی پێداویستی کەرکووك و سلێمانی ناردنی زەخیرە جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر بێتو هێنانی زەخیرەش لە ئێرانەوە بوەستێت، ئەوا لە هەردوو لا رێگای هاتنە ژوورەوە دادەخرێت، بەم جۆرەش قاتوقری دروست دەبێت، بۆیە نووسراو هاتووە ماوەیەك بە شێوەیەکی کاتی ئەو زەخیرانەی کە لە ئێرانەوە دێن بۆ ئاسانکاری و خێراتر کردنی کارەکان رسوماتی گومرگ وەرنەگیرێت، جگە لەوەی ئەوەی قەدەغەکراوە بە هەمان شێوە رێنماییەکان بەردەوام بێت، بۆ دابینکردن و ئاسانکاری کردن لە پێداویستی ئێستاش زەخیرەکان بهێنرێن، بۆ ئەمەش ئامادەکاریەکان راگەیەندراوە، تێگەیشتوون کە چارەی تر نییە، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە باس کراوە، پێویستی بە مۆڵەتی سەرووی جەنابی پەیوەندیداری وەکالەتە.






DH.MKT.02130.00068.001

| DH.MKT | 02130.00068 | 24 جەمادی کۆتایی 1316 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
لــە نــاو ســانجەقی کەرکــووك بــۆ ئاشــت کردنــەوەی نێوانــی هەندێــك عەشــیرەتەکان و نەهێشــتنی چەتــەکان جگــە لەمــە بــۆ کۆکردنــەوی پــارەی میــری لــە کات و وەختــی خۆیــدا هەندێــك خوێندنــەوە لەلایــەن قۆمیســەری پۆلیســی زور ئیســماعیل ئەفەنــدی کەرکووکــی دراوەتــە موتەســەرفی زور لەوێشــەوە دراوەتــە پەیوەندیــداری ســەدارەت، ئــەم خوێندنــەوەی لەلایــەن ویلایەتــی شــکۆداریش کــراوە، نــووسراو لــە مێــژووی ٢٠ تەممــوز ١٣١٤ نووسراوەتــەوە، کەچــی تــا ئێســتا وەڵام نەهاتــووە، هەروەهــا ئەمجــارە لەلایــەن ئیســماعیل ئەفەنــدی داواکاری پێشکەشــی پایــەی ســەدارەت کــراوە، لەســەر ئامــاژەی پێشــوو هیممــەت بکرێــت لــە جێبەجــێ کردنــی.




DH.MKT.02156.00034.001

| DH.MKT | 02156.00034 | 21 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
کاتـی خـۆی وەکـو سـەرکردەکانی تـر بـۆ ئـەوەی کەسـوکار و نزیکەکانـی تووشـی رووداوێـك نەبـن بـە مەرجـی نیشـتەجێ بـوون لـە کەرکـووك نیشـتەجێ بـووە، مانگانـەش ١٠٠٠ قـوروش مووچـەی بـۆ براوەتـەوە، لـەم دواییـە لەبـەر مەسـەلەی کوشـتن و تالانکاریەکانـی نێـوان تاڵەبانیـەکان و هەمەونـدەکان کەرکووکـی بەجـێ هێشـتووە و چۆتـە بازیـان، بـە مەرجـی جێبەجـێ کردنـی پێشـنیاری میـری کەسـوکار و نزیکەکانـی کـە لـە ٣٥ کـەس پێـك هاتـوون، بەیەکـەوە نیشـتەجێ بکرێـن، لـە چـواردەوری موسـڵ شـوێنێك دابیـن بکرێـت و بـە گوێـرەی کارەکـە لـە ژاندارمـە تۆمـار بکرێـن و مووچەیـان لـە سـندوقی دارایـی ویلایـەت دابیـن بکرێـت، ئەمـەش لەلایـەن عەلـی فەتـاح سـەرۆکی فرقـەی هەمائیلـی هەمەوەنـد داواکـراوە، بـۆ ئەمـەش سـەرۆکی ناوهاتـوو لـەوێ نیشـتەجێ کـراوە و مووچەکەشـی لـە سـندوقی دارایـی رێکخـراوە و هـۆکاری جێبەجـێ کردنیشـی تـەواو بکرێـت، نـووسراو لـە مێـژووی ٢١ تشرینـی دووەم ١٣١٤ ژمـارە ١٣٧ ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە، بـە هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە وێنەیەکـی راگەیەندراوەکـە جێبەجـێ کـردن و راگەیاندنـی راوبۆچوونـی پەیوەندیدارانـی وەکالەتـە.




محاسب مأمورینه قلمی

کرکوك قزان و هکاری و ارطغرل سنجاقلری تحریرات مدیرلری



DH.MKT.02174.00026.001

| 1316 شەوال 21 | 02174.00026 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ قەڵەمی فەرمانبەرانی ژمێریاری
بـۆ گۆرینـەوەی بەرێوەبـەری تەحریراتـی سـانجەقەکانی کەرکـووك و قـەزان و هـەکاری و ئەرتوغـرول لـە رەشنووسـی بابەتەکـە پێداچوونـەوە لـە دەفتـەری موسـڵ و تەرابلـوس و عەرەبسـتان کـراوە.



DH.MKT.02180.00033.001

| 1316 زیلقەعدە 8 | 02180.00033 | DH.MKT |
|---|---|---|

موسڵ
هەشت یەکی دەرزی سەروم کە بۆ سانجەقی کەرکووك نێردراوە، ڕەشنووسەکەی لەگەڵ ئیشقۆدرە بەیەکەوە ڕێکخراوە، چۆتە دەفتەری سەرۆکایەتی.




DH.MKT.02187.00068.001

| DH.MKT | 02187.00068 | 28 زیلقەعدە 1316 |
| --- | --- | --- |
| بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>لە سانجەقی کەرکووك سەر بە ویلایەتی موسڵ سادق ئەفەندی لە بەرێوەبەرایەتی تەحریرات بە مووچەی ٩٠٠ خەرجی رێگا ٣٦١ دەست بەکار دەبێت. | | |



DH.MKT.02194.00018.001

| 1316 زیلحیجە 16 | 02194.00018 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی پەیوەندیداری سەدارەت<br>ئەمجارە ساڵح ئەفەندی لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی سانجەقی ئەرتوغرول بۆ بەڕێوەبەرایەتی سانجەقی کەرکووك گوازراوەتەوە، لەبەر لێهاتوویەکەشی بە پلەی سێیەم پاداشت بکرێت، لە نووسراوی ویلایەتی خوداوەندکاری عالی نووسراوی ١٠ مارت ١٣١٥ ژمارە ٢٦ وەرگیراوە هاوپێچ پێشکەش کراوە، راگەیەندراوە ناوبراو شایەنی ڕێزلێنانە، بەم تێروانینە جێبەجێ کردنەکەی ڕاگەیەندراوە. | | |






DH.MKT.02199.00012.001

| 27 زیلحیجه 1316 | 02199.00012 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی عالی
لـە کۆتاییـدا سـاڵح سـوبحی ئەفەنـدی ئەرکەکـەی بـۆ بەڕێوەبەرایەتـی تەحریراتـی سـانجەقی کەرکـووك گوازتۆتـەوە، وەکـو هـاوکاری لـە سـەدا ١٥ خەرجـی ڕێـگای هەیـە، بـۆ وەرگرتنـی ئـەم بـرە پارەیـە، کـە دەکاتـە ١٣٧٧ قـوروش لـە سـاڵی ١٣١٥ لـە دەرماڵـەی ناوخـۆ هەژمـار دەکرێـت و دەنێردرێـت یاخـود لەسـەر داواکاری ناوبـراو بـە حەواڵەکردنـی بـۆ ویلایەتـی ترابـزۆن، بـە ووتـەی ژمێریـاری چۆنیەتـی کارەکـە ڕاگەیەنـدراوە.



| 15 رەجەب 1317 | 00036.00006 | **İ.AZN** |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٠٧٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
مستەفا نوری ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك لەگەڵ ئاووهەوای ناوچەکە ناگونجێت، داوای کردووە ئەرکەکەی بگوازرێتەوە، بۆ ئەمە عیززەت ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی مونتەفیك بە سوێند خواردن شوێنەکەیان بگۆردرێتەوە، بەم نووسراوە مەزبەتە لە ئەنجوومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی داد رێکخراوە و ئەوراقی روون کردنەوە بەیەکەوە نێردراوە، لەگەڵ راپۆرتی نەزارەتی دادی شکۆدار راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم



Y.PRK.UM.00047.00105.002

| Y.PRK.UM | 00047.00105 | 22 ڕەبیعی کۆتایی 1317 |
|---|---|---|

ژمارە ١

لە موتەسەرفی کەرکووك مەحمود نەزهەت پاشای بەندە

شیفرە

ناحیـەی برادۆسـت پاشـکۆی قـەزای ڕەوانـدز و لەگـەڵ ئێـران سـنووره و گرنگـی خـۆی هەیـە، بەگزادەکانـی لـە نـاو وان لەگـەڵ شـێخ عوبیدوڵـڵا زادە شـێخ سـدیق لـە قـەزای شـەمدینان بـە چەکـی مارتیـن و مـاوزەر ئامـادەن لەگـەڵ هـۆزی چەکـدار شـەر بکـەن، لەگـەڵ هاتنـی ئـەم هەواڵـە بـۆ ڕێگـری کـردن لـە ڕوونەدانـی ئـەم شـەرە، ڕۆژی ڕابـردوو یـەك مەفـرەزەی سـەربازی لەگـەڵ قائیمقامـی ڕوانـدز بـۆ ناحیـەی ناوهاتـوو ڕۆیشـتووە، ئێسـتا ئـەو تەلەگرافنامەیـەی کـە لـە خـودی خـۆی وەرگیـراوە، لـە قـەزای زێبـار سـەر بـە ویلایەتـی موسـڵ، شـێخی بـارزان لەبـەر هەندێـك بابـەت چۆتـە لای شـێخ سـدیق لـە نەهـری، لەبـەر هەندێـك هـۆکار کـە دیـارە، شـێخی بارزانـی دەسـتگیر کـردووە و ناردوویەتیـە شـەمدینان، لەبـەر ئـەوە موریـد و دیوانەکانـی تووشـی جـۆش و خـرۆش بوونـە و بـۆ ڕزگار کردنـی شـێخەکەیان نزیکـەی ١٠٠٠ لـە ناحیـەی شـتیان یەکیـان گرتـووە، سـبەی دەچنـە نەهـری کـە شـێخ سـدیقی تێدایـە، هەروەهـا ئەوانـەی پێیـان دەوترێـت دیوانـە لەگـەڵ ئـەو بەگزادانـە ڕێککەوتـوون و هـەوڵ دەدەن لەگەڵیـان ڕێکبکـەون، بـەڵام ڕێگـری لـە بەگـزادەکان کـراوە، هەروەهـا ڕێگـری لـە هۆزەکانیـش کـراوە، ئەگـەر چـی ئەمـە ڕاگەیەنـدراوە بـەڵام بـە تێروانیـن لـەو لێکۆڵینەوانـەی کـە کـراوە، لەگـەڵ ئـەو دیوانانـە هەندێـك هـۆزی قەزاکانـی زێبـاری موسـڵ و عەمادیـە و شـەمدینان ڕێککەوتنـی نهێنیـان هەیـە، لـەم بارەیـەوە، بـۆ ئـەوەی ئـەو گەندەڵیـە پەرەنەسـێنێت و فـراوان نەبێـت، پێویسـتە ئامـادەکاری پێویسـت بکرێـت، بـۆ ئەمـەش بـە ڕاگەیەنـدراوی ویلایـەت و لـە ڕواندزیـش بـە ئەنجامدانـی چالاکـی، ئـاگاداری دراوەتـە قائیمقامیـەت، فەرمـان.

مەحمود نەزهەت موتەسەرف



| DH. TMIK. M | 00072.00003 | 10 سەفەر 1317 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لەبەر ئەوەی هەر لە کۆنەوە دوژمنایەتی کۆنیان هەبووە، ناوە ناوە تووشی رووبەرووبوونەوە و شەر دەبنەوە، لە قەزای هەولێر سەرۆکی عەشیرەتی گەردی کاکل ئاغا و محەمەد ئاغا لە عەشیرەتی بلباس ناکۆکیان لە نێواندا هەیە و سەرۆکی عەشیرەتی گەردی کاکل ئاغا هێرشی کردۆتە سەر محەمەد ئاغا لە ناویان کوشتن و بریندار هەیە، دواتر هەر یەکە گەراونەتەوە شوێنی خۆیان، هەروەها لە قەزای ناوبراو لەبەر نەبوونی لێهاتووی تەواوی هێزی پۆلیس، سەرباز لە موتەسەرفی کەرکووك داواکراوە، بە پێی ئەو تەلەگرافنامەیەی کە ئێستا وەرگیراوە، لەشکری شەشەمی سەربازی همایۆن دابین کراوە.

والی موسڵ حازم




İ.TAL.00193.00016.005

| İ.TAL | 00193.00016 | 19 جەمادی کۆتایی 1317 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٨٣٠
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە زاناکانی کەرکووك عەبدی ئەفەندی بەهۆی ئەم خزمەتانەی بە نەخۆشیەکانی داوە، بە پلەی سێیەم و نائیبی پێشووی سانجەقی یەنیبازار ئەحمەد سەلیم و لە زاناکانی بەرات محەمەد سەعید ئەفەندی بە پلەی چوارەم هەر یەکە نیشانی عالی عوسمانیان پێ بدرێت، بۆ ئەمەش نووسراوی پەیوەندیداری شێخایەتی راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرموویت ئەم جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم



ŞD.00975.00021.002

| ŞD | 00975.00021 | 11 رەبیعی یەکەم 1317 |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکانی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٦٤٦٨
فەرمانبـەری ئەوراقەکانـی سـانجەقی کەرکـووك سـاقی ئەفەنـدی مـردووە، داواکاری لەلایـەن خێزانەکـەی تورسـون و کچەکانـی فەهیمـە و زەکیـە و سـوڵتان و حەسـیبە و زەینـەب خانـم کوڕەکـەی محەمـەد مەهـدی ئەفەنـدی پێشـکەش کـراوە، تـا مووچەیەکیـان بـۆ ببڕێتـەوە، بـە نـووسراوی ویلایەتـی موسـڵ باسـکراوە و لەگـەڵ داواکاریەکـە و خشـتەی مـاوەی خزمەتـی و ئەوراقـی پەیوەسـت بـەم بابەتـەدا لـە ژمێریـاری ڕێکخـراوە و لەگـەڵ پۆسـتەی دەرکەنـار لـە دەسـتەی گشـتی ووردبینـی بـۆ کـرا. لـە پۆسـتەکەدا ئـەم ماوەیـەی کـە کۆچکـردووی ناوبـراو ئـەم ئەرکانـەی وەریگرتـووە مێژوویـان نووسراوەتـەوە، لەگـەڵ ئەمـەش بـری مووچەکـەی نووسراوەتـەوە، لـە ١٧ تشرینـی دووەم ١٣١٤ کۆچـی دوایـی کـردووە، هەروەهـا بڕیارنامـەی فەرمانبەرانـی خانەنشـینی مولکیـە بـە مـاددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ دوای زیـاد کـردن و کـەم کـردن لـە مووچەکـەی ٢١٠ قـوروش ماوەتـەوە، ئـەم بـڕە مووچەیـەش لـە نێوانیـان بـە یەکسـانی دابـەش دەکرێـت، هـەر یەکەیـان ٣٠ قوروشـی بەردەکەوێـت، مامەڵـەی ئـەم مووچـە بـێ خاوەنـە لەسـەر جێبەجـێ کردنـە، نووسراویـش لـە سـندوق کـراوە بـۆ دابیـن کردنـی، لـەم بابەتـەدا بڕیار و فەرمان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمان دەردەکات.



| İ.DH | 01373.000039 | 17 زیلقەعدە 1317 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی همایۆنی ئێستا
٣١٧٨
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
موتەسەرفی سانجەقی ماردین جەنابی رائف ئەفەندی لە مەسەلەی دە یەك و مەرومالآت گەندەڵی کردووە، بە گوێرەی ئەوراقی لێکۆڵینەوە کە لە ویلایەتی دیاربەکر هاتووە، بۆ ووردبینیی کردنیش حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، بەڵام لە کۆتاییدا بە تێروانین لەم ئاماژەیەی کە لە ویلایەتی ناوهاتوو دەرچووە، دەرکەوتووە ناوبراو گونجاو نییە ئەرکەکەی لەوێ درێژە بکێشێت، بە گوێرەی ئەم بریارەی کە لە شورای ناوهاتوو دەردەچێت مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك جەنابی محەمەد نەزهەت پاشا داوای کردووە ئەرکەکەی بۆ شوێنێکی تر بگوازرێتەوە، بۆیە گۆڕینەوە بە ئەرکەکەیان بکرێت، بۆ ئەمەش مەزبەتە لە قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دراوەتە قەڵەم نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار و کاغەزی وەرگێرانی کەسێتی بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت.
سەدری ئەعزەم



| BEO | 001418.106278 | 11 شەعبان 1317 |
|---|---|---|

نووسراو بۆ نەزارەتی دادی شکۆداری، لایەنی عالی
سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك راغـب بـەگ دوورخراوەتـەوە لـە شـوێن ئـەو سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی هـەکاری مسـتەفا نـوری و بـۆ سـەرۆکایەتی ناوهاتـووش یاریدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی بایەزید عارف حیکمەت بۆ شـوێنی ئەویش لە دەرچووی مەکتەبـی یاسـای شـاهانە ئیبراهیـم فـەوزی ئەفەنـدی سـوێندی یاسـایی بخـۆن و بگوازرێنـەوە و دابمەزرێـن، بـۆ ئەم مەبەسـتەش نـووسراوی ٤ رەجـەب ١٣١٧ ژمـارە ٥٠٥ بـۆ سـەروو نێـردراوە و بـە فەرمانـی پاشـایی لەلایـەن جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت لـە مێـژووی ٦ شـەعبان ١٣١٧ رەزامەنـدی نیشـان دراوە، کارەکـە لەسـەر جێبەجـێ کردنـە.



BEO.001444.108285.001

| BEO | 001444.108285 | 20 شەوال 1317 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

بـۆ ئاشـتکردنەوەی نێـوان سـەرۆك هۆزەکانـی سـانجەقی کەرکـووك و سـلێمانی، پێویسـت بـە داوەت کـردن نـاکات، ئـەو ئامادەکاریانـەی لـەم رێـگاوە دەکرێـت پەکـی کەوتـووە، لەسـەر ئەمـە بـە گەرانـەوەی دەسـتەی چاکسـازی بارودۆخەکـە زیاتـر تێـك دەدات، لەسـەر هەندێـك ووتـە و پوختـەی بابەتەکـە و داواکردنـی زانیـاری لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە دەرچـووە، بـە گواسـتنەوەی تەلەگرافنامەکـە، لـە دەسـتەی چاکسـازی کەرکووکیـش تەلەگرافنامـە هاتـووە، بـۆ لایەنـی پایەبـەرز نێـردراوە، لەسـەر بەراییـەکان بـە پەلـە و بـە قسـەکردن لەگـەڵ ویلایـەت، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە و راگەیاندنـی، بەراییەکانیـش بنێردرێتـەوە.



BEO.001447.108500.001

| BEO | 001447.108500 | 26 شەوال 1317 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
بۆ ئەوەی داهاتی لەشکری شەشەمی همایۆن بە پەلە ڕێك بخرێت، نووسراو حەواڵە کراوە، بە ئاگادار کردنەوەی فەرمانبەرانی دارایی ویلایەت جێبەجێ کراوە و لەسەر وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٢ شەوال ١٣١٧ ژمارە ٢٢٨٩ بۆ لاینی واڵای سەرعەسکەر ئاگادار کراوەتەوە، ئەمجارە لە سەرعەسکەری ناوهاتوو نووسراو لە مێژووی ٢٠ شەوال ١٣١٧ ژمارە ١٠٤٦ نێردراوە، لە تابورەکانی کەرکووك و چەمچەماڵ ئەو سەربازانەی کە ئەرکی فەرمانبەرێتی سەربازیان تەواو کردووە، مووچەکانیان نەدراوە، ئەمەش کاریگەری لە سەر ملکەچ بوون بە ئەرکی سەربازی دەبێت، لە ویلایەت داوای ١٢٠ هەزار قوروشیان کردووە، بەڵام نایاندرێتێ، ئەمەش بە شێوەیەکی تەواو دەرکەوتووە، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە ئەمجارە لە موشیرەتی لەشکری ناوهاتوو ئاماژەی پێکراوە، هەروەها لەم شوێنانە پارچەکانی سەربازی بەیەکەوە بەستراونەتەوە، هەروەها کارگێری فرقەی ١٢ی همایۆن ماوەیەکە کەوتوونەتە ژێر کێشەوە، لەم بارەیەوە بە گوێرەی ئاماژەکان بۆ ئەوەی نیشان بدرێت بە چ شێوەیەك دابین دەکرێت، ئەوا لە ویلایەتی بەغداد ئەو برە پارەیەی کە حەواڵە کراوە، بە گوێرەی پێویست هەرچی زووە کارەکە جێبەجێ بکرێت، بە تێروانین لە چۆنیەتی جێبەجێ کردن ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت و هیممەت بکرێت بە ناردنەوەی هاوپێچ.

DH.MKT.02206.00055.001

| DH.MKT | 02206.00055 | 13 موحەررەم 1317 |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵ
لەلایەن هۆزەکانی هەمەوەند و شوان هێڵی تەلەگرافی چەمچەماڵ و کەرکووک تێك دراوە، بۆچاککردنەوەی ئەو هێڵە، چاوشی تەلەگراف رۆیشتووە بۆ پاریزگاری کردن لەم چاوشە لە حکوومەتی خۆچێی پۆلیس هاوەڵی کردووە، بەڵام ئەو پۆلیسانە بوێریان نەکردووە تا شوێنی مەبەست لەگەڵی برۆن، لە نیوە رێگا گەراونەتەوە، هەروەها دووبارە لە رۆیشتنەوەیان پاریزەرانی چاوش بە هەنگاو ئاگاداری حکوومەتیان کردۆتەوە، بەڵام هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەهێناوە، جگە لەوە ئەو هۆزە ناوبراوانە بەردەوام دەستدرێژی دەکەنە سەر هێڵی تەلەگراف و چاوشەکان، بۆیە لە کاتی سەردانی موشیرەتی لەشکری شەشەمی همایۆنی ویلایەت لە باش مودیریەتی تەلەگراف و پۆستەی بەغداد راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی لە نەزارەتی تەلەگراف و پۆستەی نووسراو لە مێژووی ٢٦ نیسان ١٣١٥ ژمارە ١١٠ نێردراوە، کە پێویستە لەگەڵ پاریزگاری کردن لە هێڵی تەلەگراف ئامادەکاری کاریگەر جێبەجێ بکرێت و دابین بکرێت، لە رووی یاساییشەوە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکان.



DH.MKT.02215.00006.001

| 15 سەفەر 1317 | 02215.00006 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی عالی<br>ساڵح سوبحی ئەفەندی ئەرکەکەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی سانجەقی کەرکووك گوازراوەتەوە، خەرجی ڕێگای کە لە ١٣٧٧ قوروش پێك دێت، لێرە ڕێکخراوە، بۆ ئەوەی لەوێ خەرجی ڕێگای پێ نەدرێت ئەوا نووسراو کراوە و ڕاگەیەندراوە. | | |



| DH.MKT | 002251.00021 | 20 جەمادی یەکەم 1317 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ و نەزارەتی دارایی

لـە مامەڵـەی باجـدا لـە خەزینـەی شـکۆدار کـردەوەی زیـان بەخشـیان ئەنجـام داوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە قـەزای هەولێـر سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووک لـە ناحیەکانـی دیزەیـی و بەرانەتـی فەرمانبـەری پێشـووی بـاج محەمـەد موخلیـس و محەمـەد رەشـید ئەفەنـدی لـە دادگاییکردنیـان بـە بریـار نامـە بریـاری لەسـەر دراوە، لـە ویلایەتـی موسـڵ لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری داواکاری دراوەتـە دەسـتەی تـاوان، بـۆ پێداچوونـەوە لـە کەرکـووک لەلایـەن بەرێوەبـەری بـاج داواکاری پێشـکەش بـە دادگای پێداچووەنـەوەی سـەر بـە شـورایی دەوڵـەت کـردووە.


DH.MKT.02285.00046.001

| 13 شەعبان 1317 | 02285.00046 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی عالی<br>لەبەر خراپی بارودۆخی و گۆڕینی کەشوهەوا سێ مانگ مۆڵەتی داواکردووە تا روو بکاتە وان، جگە لەمە بە نیازی گۆڕینی ئەرکەکەی، بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك ساڵح سوبحی ئەفەندی داواکاری پێشکەش کراوە، بۆ سەروو نێردراوە بە تێروانین لە لیستی داواکاریەکە عالی خوێندنەوەی بۆ کردووە. | | |



| 1317 شەعبان 29 | 02292.00035 | DH.MKT |
|---|---|---|

نامەی قەڵەمی ناوەخۆ
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بەهـۆی ئـەو کارە نەشـیاوانەی کـە لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك و سـلێمانی روویانـداوە، بریـاری چاکسـازی دراوە، بـۆ چاکسـازیەکەش میـری لیـوا یوسـف پاشـا ئەرکـی پێـدراوە لەگـەڵ مەفرەزەکـەی دەسـتیان بـە کار کـردووە و ئەنجامدانـی کارەکەیـان راگەیانـدووە، لـە راگەیاندنـی خۆشـحاڵ بوونیـش راگەیەنـدراوە، لەسـەر هەندێـك داواکاری کـە بـە واژووی جۆراوجـۆر لـە مەرکـەزی کەرکـووك بـۆ لایەنـی واڵای سـیپاهیدار رۆیشـتووە، لەگـەڵ نـووسراوی مێـژووی ٢٧ تشرینـی دووەم ١٣١٥ لەگـەڵ دوو تەلەگرافنامـە حەواڵـەی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەتی لایەنـی عالـی کـراوە، لەسـەر ئـەو داواکاریـەی کـە هاتـووە، راپۆرتـی سـەرپێچی کـەران کـە ئەوانـەی ناویـان دیـارە، چەنـد کەسـێکیان دوورخراونەتـەوە هەروەهـا پارەوپـول و ئەملاکـی شکسـتخواردووەکان کـە بەدەسـتیان کەوتـووە، بیاندرێتـەوە و لـەم بابەتـەدا لەسـەر ئـەم تەلەگرافنامانـەی کـە لـە پەیوەندیـداری سـەدارەت و نەزارەتـی عاجیزانـە دەرچـووە، لـە تەلەگرافنامـەی مێـژووی ١٤ تشرینـی دووەم ١٣١٥ لەگـەڵ نـووسراوی زانیـاری دەرکەوتـووە، بـە پەلـە لێکۆڵینـەوە بکرێـت و هیممـەت بکرێـت لـە راگەیاندنـی.





DH.MKT.02297.00103.001

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>02297.00103</th><th>17 رەمەزان 1317</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٥ کانوونی یەکەم ١٣١٥ ژمارە ١٨٧ دەستووری عالییە: عەبدولرەحمان ئەفەندی کە لە بەڕێوەبەراتی تەحریراتی سانجەقی کەرکووک جیابۆتەوە داوا دەکات بڕیار بدرێت تۆمارەکەی ڕاست بکرێتەوە هەروەها ئەرکێکی پێ بدرێتەوە، بەڵام لەبەر لێنەهاتوویی ناتوانرێت ئەرکی پێ بدرێت، بە گوێرەی ئاماژەی ویلایەتی موسڵ بە تۆمار دوورخستنەوەی روون بۆتەوە، لەگەڵ ئەمەش لە کۆتاییدا لە ویلایەتی ناوهاتوو بە نووسراو ڕاگەیەندراوە کە ناوبراو لە بنەماڵەیەکی لێهاتوو و ڕەوشتی بەرزە، بۆ ئەمەش نووسراو بۆ سەروو کراوە.</td></tr>
</table>



| DH.MKT | 02321.00003 | 19 زیلحیجە 1317 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیداری سەدارەت
بەهۆی چڕی باران و زۆری ماوەکەی، رووباری دیجلە و رووباری زاب کە دەکەوێتە نێوان کەرکووك و هەولێر هەڵساوە و ئەگەر زیانی بە یەکەمیش نەگەیاند بێت ئەوا دووەمیان شارۆچکەی ئاڵتون کۆپری زیاتر لە ٢٠٠ خانە و دوکان و شوێنی تری تێك داوە، ئەلحەمدولیللا زیان بە دانیشتووانی نەگەیاندووە، لەگەڵ ئاگادار کردنەوەی موتەسەرفی کەرکووك، فەرمانبەر نێردراوە بۆ ئەوەی ئەوانەی ماونەتەوە لە شوێنێکی گونجاو نیشتەجێ بکرێن، هەروەها لێکۆڵینەوە لەسەر زیانەکان بکرێت، هەر کە وەڵام هات ئەوا زانیارییەکان بدرێنە ویلایەتی موسڵ، ئەوانیش بە رێگەی تەلەگرافنامە بدرێتە پەیوەندیداری سەدارەت، هەروەها بۆ باشتر کردنی بژێوی دانیشتوانەکەی و قەرەبووکردنەوەی زیانەکان دەست بە کار بن.

DH.SN.THR.00010.00016.001

| DH.SN.THR | 00010.00016 | 28 ڕەبیعی یەکەم 1318 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدز هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٢٤١٢
لەگـەڵ نـوسراوی بـە مێـژووی دوێنێـی بەندەمـان ئـاگاداری دراوە، کـە لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی پشـکنین ئەنجـام دەدرێـت، بۆیـە لـە لایەنـی مولکیـە و لـە ئەندامانـی قۆمیسـیۆنی پشـکنینی سـەربازی لـە هـەر یەکـە دوو کـەس لـە دەسـتەیەك دامەزرێـن و هـەر ئێسـتا دەسـت بـە ڕۆیشـتن بکـەن، هەروەهـا بـۆ ڕۆیشـتنی دەسـتەیەکی ئـاوا تەنیـا بـە ڕەزامەنـدی سـەروو دەبێـت، ئەمـەش لەسـەر فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیدارانـی خەلافـەت وەسـتاوە، کەچـی بڕیارنامـەی ڕاگەیەنـدراوی ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان بـۆ کەرکـووك ڕۆیشـتووە، بـۆ سـەروو نووسراوەتـەوە کـە دەسـتەی چاکسـازی لـە کامـە لایـەن فەرمانـی وەرگرتـووە تـا بـڕوات؟. هەروەهـا لـە بڕیارنامـەی ناوهاتوودا ئـەو ٩ کەسـەی کـە بە تاوانـی کوشـتن تاوانبار کـراون، ڕاگەیەنـدراوە و بڵاوکراوەتـەوە، ئـەم دەسـتەی ناوهاتـوو نابـێ کارێکـی تـاك لایەنـە بـکات و تا دەسـتەی پشـکنین دێت لە بـارەی ئەم کەسـانەوە شـتێك نەکـەن و بـە ببەسـترێنەوە بـە کەفالـەت، ئەمـەش لـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیدارانـی خەلافـەت ڕاگەیەنـدراوە و لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.




یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی
۲۷۸۴



İ.HUS.00083.00140.001

| 15 ڕەبیعی کۆتایی 1318 | 00083.00140 | I.HUS |
| --- | --- | --- |

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٢٧٨٤

بـۆ ئەنجامدانـی هەندێـك لێکۆڵینـەوە لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، جەنابـی پاشـا بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، تـا ئەندامـی قۆمیسـیۆنی عالـی پشـکنینی سـەربازی میـری ئـاڵای وەلـی بـەگ بنێردرێـت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات، لـە ١٥ ڕەبیعـی کۆتایـی ١٣١٨ لـە ٢٩ تەممـوز ١٣١٦.
جەنابی سەر کاتیب




OSMANLI ARŞİVİ
DH.TMIK.M
٩٠ | ٩

DH.TMIK.M.00090.00009.001

| DH.TMIK.M | 00090.00009 | 25 سەفەر 1318 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ۲٥٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت ئەمنیەت و ئاسایشی سانجەقەکانی کەرکووک و سلێمانیەیان جێگیر کردووە و بە رۆیشتنیان بۆ قەزاکانی سەر بە مەرکەزی ویلایەت، لەوێ ئەو شێخانەی بوونیان هەیە، ناکۆکی نێوان شێخەکان و بە چ شێوەیەك رووبەرووبوونەوەی نێوان ئەم شێخانەیان یەکلاییکردۆتەوە؟، هەر هەمووی لەلایەن جەنابی حەمدی بەگ ئەفەندی یاریدەدەری والی موسڵ بە نووسراو باسکراوە و هاتووە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری دەرەوە




یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی
٤٦٨١

227/90
İ.TAL.1318/C-90

İ.TAL.00227.00090.001

| 15 جەمادی کۆتایی 1318 | 00227.00090 | İ.TAL |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٤٦٨١
راگەیەندراوی بەندەمانە
لەسەر لێهاتووی و تواناییەوە موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك عوسمان بەگ پلەی میری میرانی پێ دەدرێت، بۆ ئەمەش جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا فەرموویەتی، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

DH.ŞFR.00253.00044.001

DH.ŞFR.00253.00044.001

| DH.ŞFR | 00253.00044 | 8 رەجەب 1318 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
سـانجەقەکانی سـلێمانی بـە هەمـوو شـێوەیەك گرنگـە و هەردووکیشـیان بـە تەواوەتـی لەسـەر بارودۆخـی بـاش و توانـا لەگـەڵ خـوی خۆچێـی موتەسـەرفەکانەوە وەسـتاوە، راگەیەنـدراوە و روون کراوەتـەوە کـە پێویسـتە پشـکێنەری دادی قوسـوە ئیشـقۆدرە غالـب بـەگ ئـەو سـیفەتانەی هەمـوو تێدایـە، باسـکراوە ئەگـەر عوسـمان بـەگ موتەسـەرفی کەرکـووك نەیـەت، ئەگـەر بێتـو بێتـە ئەوێـش، ناکرێـت بـە درێژایـی مـاوە ئیدارەکـە بـە وەکالـەت بەرێوەببردرێـت، راگەیەنـدراوە پێویسـتە لـە موتەسـەرفیەتی سـلێمانی دابمەزرێـت، کات نەمـاوە بـە خاڵـی بمێنێتـەوە، تـکا دەکرێـت وێنـەی تایبەتـی رابگەیەندرێـت.
حازم والی موسڵ



| 11 رەبیعی کۆتایی 1318 | 01377.000019 | I.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆن ئێستا
١١١٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بـۆ ئەنجامدانـی پشـکنین لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی لەلایەنـی مولکیـە و ئەندامانـی قۆمیسـیۆنی پشـکنینی سـەربازی عالـی لـە هـەر یەکەیـان دوو کـەس هەڵدەبژێردرێـت و لـە دەسـتەیەك دادەمەزرێـن و رەوان دەکرێـن، جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا فەرموویەتـی و نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار ئاگادارکراوەتـەوە، لەلایەنـی مولکیـە مامەڵـەی لێکۆڵینـەوە وەسـتاوە و ئـەوەی زانیـاری هەبێـت یاریـدەدەری بەڕێوەبـەری ناوەخـۆی مەکتوپچـی و بەڕێوەبـەری قەڵەمـی فەرمانبـەران تۆفیـق بـەگ ئەفەنـدی لەگـەڵ نەجیـب بـەگ کـە لـە موتەسـەرفیەتی قـەزان جیابۆتـەوە، دەسـت بـە کارەکـە دەکـەن، هەروەهـا بـۆ ئـەم خزمەتـەی ناوبـراوان هـەر یەکـە ٥٠٠٠ قـوروش زیادە دەچێتـە سـەر مووچەکەیـان، لەگـەڵ ڕێـژەی ئـەو مووچەیـەی کـە وەریدەگـرن خەرجـی ڕێـگای چـوون و هاتنیـان پـێ دەدرێـت، جگـە لەمـە نەجیـب بـەگ کـە مووچـەی دابراوانـی بـۆ بەسـتراوەتەوە، حاڵـی حـازر رادەگیرێـت بـۆ ئەمـەش لـە وەڵامـدا لـە نەزارەتـی ناوهاتـوو نـووسراو راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو نووسرایـەوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم



| 16 سەفەر 1318 | 001503.112682 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی دادی شكۆدار لایەنی عالی
سـەرۆكی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی قـەزان تۆفیـق بـەگ و یاریـدەدەری داواكاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی یەنیبـازار حیلمـی ئەفەنـدی بـە هـۆی ئەنجامدانـی مامەڵـەی خـراپ لـە ئەركـی پێشـوویان دەدرێنـە دادگا دوای ئـەوەی بێتاوانیـان دەردەچێـت ئـەم كاتـە هەڵدەبژێردرێـن بـۆ دوا ئەركیـان، بـە دوور خسـتنەوەیان سـەرۆكی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی قـەزان سـەرۆكی پێشـووی فەرمانگـەی سـزای سـانجەقی مـوش عومـەر ئەفەنـدی و بـۆ یاریـدەدەری داواكاری گشـتی یەنیبـازار یاریـدەدەری داواكاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی كەركـووك عیـززەت ئەفەنـدی و هەروەهـا بـۆ ئـەم یاریـدەدەرەش سـەرۆكی پێشـووی دادگای سـەرەتایی جەبـەل و روز رفقـی ئەفەنـدی دوای سـوێند خـواردن دادەمەزرێـن، لـەم بارەیـەوە لەسـەر راپۆرتـی لـە مێـژووی ١ سـەفەر ١٣١٨ ژمـارە ١٦٠ هاتـووە، جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەكرێـت.



| 18 سەفەر 1318 | 001504.112740 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لـە بەڕێوەبەرایەتـی تەحریراتـی سـلێمانی بـە مەغـدوری دوورخراوەتـەوە، لـەم کاتەشـدا بەڕێوەبـەری تەحریراتـی سـانجەقی کەرکـووک شـوێنەکەی بـێ خاوەنـە، بۆیـە دامەزراندنـی ناوبـراو بـە واژووی بەهائەددیـن لـە هەولێـرەوە تەلەگرافنامـە دەرچـووە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |



| 17 رەبیعی کۆتایی 1318 | 001533.114923 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر و نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـۆ ئەنجامدانـی هەندێـك لێکۆڵینـەوە لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، لـە ئەندامانـی قۆمیسـیۆنی چاودێـری سـەربازی عالـی میـری ئـاڵای وەلـی بـەگ بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا دەنێردرێـت، بـە نـووسراوی تایبەتـی مابەینـی هومایۆنـی بـاش کیتابەتـی شـکۆدار ئامـاژەی پێکـراوە و چۆنیەتیشـی لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار نـووسراوی بـۆ کـراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |



BEO.001534.115047.002

| 13 رەجەب 1318 | 001534.115047 | BEO |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
هۆبەی چوارەم
١٢٦٤
راگەیەندراوی بەندەمانە
لـە دەسـتەی پشـکنینی سـانجەقەکانی سـلێمانی و کەرکووکـە، لەبـەر ئـەوەی لـە موسـڵ نەخـۆش کەوتـووە، ئامـاژە لـە لایـەن تۆفیـق بـەگ هاتـووە دوای ئـەوەی چـاك بۆتـەوە، چۆتـە کەرکـوك، لـە دەسـتەی ناوهاتـووش کۆبۆتـەوە و روویـان کردۆتـە سـلێمانی، بـە ئامـاژەی قوماندانـی فرقـەی ١٢ لـە موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایۆنـی شـکۆدار تەلەگرافنامـە لـە مێـژووی ٢١ تشرینـی یەکـەم ١٣١٦ روون کردنـەوە دراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەر عەسکەر


BEO.001535.115113.001

| 20 ڕەبیعی کۆتایی 1318 | 001535.115113 | BEO |
|---|---|---|
| نەزارەتی مەعاریفی شکۆدار<br>میـر یوسـف سـەرۆکی عەشـیرەتی خۆشـناوە و ئـەم عەشـیرەتە سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووک و قـەزای کـۆی سـانجەقە، لەلایـەن ئیسـماعیل بـەگ قۆمیسـەری پۆلیسـی سـانجەقی زور داوای کـردووە کوڕەکـەی لـە مەکتەبـی عەشـیرەت وەربگیرێـت، لـەم داواکاریـەی کـە داویەتـی لەگـەڵ بروانامـەی نـاردووە، نـووسراوی ٦ ڕەبیعـی کۆتایـی ١٣١٨ ژمـارە ١ی موتەسـەرفی زور نێـردراوە لەگـەڵ هاوپێچەکانـی بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |




BEO.001578.118276.001

| 13 رەجەب 1318 | 001578.118276 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی دەفتەرخاقانی شکۆدار

لە زەوییە جۆڵەوانیەکانی ناحیەی مەلحە سەر بە سانجەقی کەرکووك بە شێوەی داهاتی بەدەل بە قست جێبەجێ دەکرێت، بۆیە ٤ نەفەری گونجاو دەست نیشان بکرێت، تاوەکو بە کارەکە هەڵسن، لەسەر ئەم داواکاریەی کە سەرۆکی پێشووی دادگای سەرەتایی بەغداد ئەحمەد ناجی ئەفەندی پێشکەشی کردووە، لە نووسراوی مێژووی ١٤ رەجەب ١٣١٧ بە گفتوگۆکردن لەگەڵ شورای دەوڵەت لە وەڵامدا نووسراو هاتووە و لە کاتی حەواڵەکردنی زەوی ناوهاتوو هەروەك پروپاگەندەی بۆ دەکەن، خالی نییە و وێرانە نییە، بەڵکو کشتوکاڵی لێ دەکرێت و ١٧ گوند لە خۆ دەگرێت، هەروەها لە ٤٨ هەزار دۆنم پێك دێت و ئەم موزایدەیەی بۆی کراوە لەسەر داواکاریەکان بە بەدەلی ١٣١ هەزار قوروش ماوەتەوە و زەوی کشتوکاڵی لەم شێوەیە و دانیشتوانەکەی داوای دەکەن، هەروەها ساڵانە بە گشتی گوندەکان دە یەك و رسومی مەڕومالات و باجی کەلوپەل و مولکی تایبەت دەدەن، بۆیە گونجاو نییە ئەم زەوییانە بدرێتە کەسانێکی تر، لەم وەڵامەی کە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە، تێدا روون کراوەتەوە، جگە لەمە ئاماژەکە گونجاوە و زانیاری بدرێتە نەزارەتی شکۆدار، بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو ئامادە کراوە.



| 5 زيلحيجه 1318 | 001638.122820 | BEO |
| --- | --- | --- |

نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
لـە مووچـەی دەسـتکورتانی سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، ٥٣٧ قـوروش بـێ خاوەنـە، وەکـو سـەدەقەی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت لـە سـلێمانی بدرێتـە شـێخ مەعسـوم ئەفەنـدی شـێخی تەریقەتـی خالدییـە، لەگـەڵ هاوپێچـی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار دراوەتـە سـەروو، لـە نـووسراوی مێـژووی ٣ زیلحیجـە ١٣١٨ ژمـارە ١٥٤ نووسراوەتـەوە، بـە تێروانیـن لـەم نووسراوانـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.

| 24 ڕەبیعی یەکەم 1318 | 02377.00100 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ
بـە فەرمانـی جەنابـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـانی دراوە، فرقـەی ڕەدیفـی کەرکـووک سـاڵی ١٣٠٥ فەرمانبەرانـی چاودێـری و پشـکنینی ئەرکانـی جەنگـی ئاغـای قـول ئەحمـەد جـەودەت ئەفەنـدی ئەنجامـی پکشـنینەکانی لـە لیسـتێك ڕێـك خسـتووە و ناردوویەتـی، لـە دەسـتەواژەیەکی فرقـەی ناوبـراوی دامەزرانـدووە، فەرمانگەکانـی تابـوری کەرکـووك، ئاڵتـون کۆپـری، شـەقڵاوە، هەولێـر، کـۆی سـانجەق، ڕانیـە، سـلێمانی، پێنجویـن، گولعەنبـەر، قەرەتەپـە، سـەڵاحیە، تۆزخورماتـو، داقـوق، چەمچەمـاڵ، بـە ڕێکـەوت بـووە، لـە ڕێگـەی مامەڵـەی ناسـنامە جولـەی نەکـردووە، زۆر گونـد هەیـە ناسـنامەی تۆمـار نەکـراوە، تۆمارەکانـی پشـکنینیان بـۆ نەکـراوە، هەروەهـا لەدایکبـوون و مارەبڕیـن لەلایـەن حکوومـەت نیشـان نەکـراوە. هەروەهـا خەڵکـی ناوچەکانیـش بـۆ ئـەم کارە بـۆ ئـەم جـۆرە تایبەتمەندییانـە سـەردانی حکوومەتیـان نەکـردووە، ناسنامەکانیشـیان مامەڵـەی تۆمـار و نووسـینی بـۆ نەکـراوە، مردووەکانیشـیان لەلایـەن موختـارەوە بـە ووتـەی ئـەو کاری بـۆ کـراوە، گواسـتنەوەش بـە هیـچ شـێوەیەك لـە دەفتـەر جێگیـر نەکـراوە، هەروەهـا لـە نووسـینە جۆراوجـۆرە نوێیەکانـدا بـۆ هەندێـك کـەس لـە دەفتـەری کۆنـی ناسـنامە لـە هەمـوو دەفتەرەکانـی تـر دەردەهێنرێـت، بـۆ هەندێکـی تریـش بـە گۆرانکارییـەوە بـە دوو سـێ مامەڵـەی سـەربازی کارەکان جێبەجـێ دەکرێـت، هەروەهـا زۆربـەی گوندەکانیـش لـە ڕووی ناسـنامەکانیانەوە کەموکـوری تێدایـە، هەندێکـی تریـش زیادەڕۆیـی تێدایـە. هەروەهـا ئـەو فەرمانبەرانـەی کـە لـە فەرمانگـەی ناسـنامە بوونیـان هەیـە، سـەردانی گوندەکانیـان نەکـردووە، بـە هـەر حـاڵ لـە بـارەی ناسـنامەی خەڵکەکـە ئـەوەی پێویسـتە ئەنجـام بدرێـت لـە ڕووی مامەڵـەی ناسـنامەوە کارەکان جێبەجـێ نەکـراون. لـە بابەتـی ڕاگەیانـدن و یەدەگـەوە ئـەو دانیشـتووانەی کـە بوونیـان هەیـە، بـە پێـی بەرژەوەنـدی بـۆ ناوچەیەکـی تـر دەڕۆن، بـە یاسـانامەی یەدەگـی هومایـۆن بـە پشـت بەسـتن بـە کەرسـتەی یاسـای تایبەتـی پۆلیسـی بلۆکـەکان و هەروەهـا تـا حکوومەتـی ناوەخـۆ دڵنیایـی نـەدات، لەلایـەن فەرمانبەرانـی ناسـنامە نـووسراوی تێپەڕانـدن نادرێـت، لـەم بارەیـەوە گرنگـی پـێ نادرێـت، ئەگەرچـی لـە تابورەکانـی هەولێـر و چەمچەمـاڵ و کـۆی سـانجەق گواسـتنەوەی قۆمیسـیۆنی سـەربازی دامـەزراوە، لـەم بارەیـەوە بـە پشت بەسـتن بـە یاسانامەی هومایۆن، مـاددەی یاسا مامەڵـەکان جێبەجـێ ناکرێـت، لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی لەگـەڵ تابـوری پێنجویـن ڕێکەوتـە لەگـەڵ قەزاکانـی شـەهربازار، گولعەنبـەر، سـەڵاحیە، ڕانیـە، مەعمـورەی حەمیدیـە هێشـتا کاری بـاس کـراو لـە سـەرەوە و قۆمیسـیۆنەکانی پشـکنین دانەمـەزراوە، لەمـەودوا بـە پشـت بەسـتن بـەو یاسـاییەی کـە هەیـە، مامەڵـەکان جێبەجـێ دەکرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە مێـژووی ١٠ مایـس ١٣١٦ ژمـارە ١٨٠ نـووسراو نوسراوەتـەوە، ئـەو ناوچانـەی کـە ناسـنامەیان تۆمـار دەکرێـت، مامەڵەکانیـان لـە کاتـی داواکردنیـان نابـێ زانیـاری دەربچێـت، لـە بـارەی فەرمانبەرەکانیـش بەرپرسیارێتی توندیـان لـە سـەرە، هەرچـی زووە مامەڵـەی ناوبـراو لەگـەڵ چاکسـازی بکرێـت، لـە بـارەی گواسـتنەوەی سـەربازی ئـەو ڕژێمانـەی کـە بوونیـان هەیـە، بـە پشت بەسـتن بـە یاسـاکان مامەڵـەی نـووسراوی تۆمـاری ناسـنامەی فەرمانگـەی گشـتی جێبەجـێ بکرێـت، بـە ووتـەی تۆمـاری ناسـنامەی فەرمانگـەی گشـتی ڕاگەیەنـدراوە پەلـەی تێـدا بکرێـت.



| 29 ڕەبیعی کۆتایی 1318 | 02395.00109 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ قەڵەمی مەکتوپچی ناوەخۆی بەڕێوەبەری مەعاریف و بەڕێوەبەری قەڵەمی فەرمانبەران میری میران جەنابی تۆفیق بەگ ئەفەندی لەگەڵ نەجیب بەگ کە لە موتەسەرفیەتی قەزان جیابۆتەوە هەروەها پشکێنەری سەربازی میری واڵای والی بەگ ئەندامی قۆمیسیۆنی عالی

بە مەبەستی ئەنجامدانی کاری پشکنین لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی، بڕیار و فەرمانی هومایۆنی جەنابی پەیوەندیدارانی خەلافەت لە دەستەی مولکیە نەجیب کە لە موتەسەرفیەتی قەزان جیابۆتەوە، هەروەها لەلایەنی سەربازی پشکێنەری سەربازی میری واڵای والی بەگ ئەندامی قۆمیسیۆنی عالی دادەمەزرێن و ڕوو دەکەنە ناوچەکە، بۆ ئەم مەبەستە جەنابی پاشا چ بفەرمووێت ئەو ئەنجام دەدرێت، چۆنیەتی کارەکەش بە ئەندامانی تری دەستە ڕابگەیەندرێت.




DH.MKT.02408.00022.001

| DH.MKT | 02408.00022 | 2 جەمادی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت
بەهـۆی خزمـەت و هاوکاریەکانـی لـە بـواری کاروبـاری تۆمارکردنـی تابـووری زەبتیـەی سـانجەقی کەرکـووک کاتیبـی گرتووخانـەی کەرکـووک بـە نـاوی سـاڵح ئەفەنـدی داواکاری نـاردووە تـا پاداشـت بکرێـت، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکەشـی نـووسراو رەوانـی لایەنـی والای سـەر عەسـکەر کـراوە، هەروەهـا مامەڵـەی پـرس و راکـردن بـە ویلایەتـی موسـڵ ئەنجـام دراوە، لەبـەر ئـەوەی ئەرکەکـەی بـە رێکوپێکـی ئەنجـام داوە لـە وەڵامـدا لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو نـووسراوی ١٢ ئۆغسـتۆس ١٣١٦ ژمـارە ٥٥ پێشـکەش کـراوە، تـا لـە پلـەی پێنجـەم نیشـانی مەجیـدی پـێ بدرێـت، ئەمـەش رای پەیوەندیـداری سـەدارەتی پێویسـتە.




داخلیه مکتوبی قلمی



DH.MKT.02415.00040.001

| DH.MKT | 02415.00040 | 22 جەمادی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی پۆستە و تەلەگرافی عالی

ئەگـەر پێویسـت بـکات و بـۆ کارەکـە سـوودی هەبێـت بـە داهاتـی باجەکانـەوە تەلەگرافخانەیـەك دابمەزرێـت و بونیـاد بنرێـت، لـە مەرکـەزی قـەزای رانیـە مەرکەزێکـی تەلەگـراف دروسـت بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە ئـەو بریارنامەیـەی کـە لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکووکـەوە هاتـووە، هەروەهـا لەبـەر گرنگـی شـوێنی جوگرافـی قـەزای ناوهاتـوو پێویسـتە لـەوێ مەرکەزێکـی تەلەگـراف دروسـت بکرێـت، نـووسراوی مێـژووی ٢٦ ئۆغسـتۆس ١٣١٦ ژمـارە ٥٩ کـە لـە ویلایەتـی موسـڵی عالـی هاتـووە هاوپێـچ بـۆ سـەروو نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی و رابگەیەندرێـت.



| 12 رەجەب 1318 | 02425.00063 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی خزمەتی فەرمانبەران
وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ٣٠ ئەیلـوول ١٣١٦ ژمـارە ٩: هەرچەنـدە دووبـارە ڕەزامەنـدی دراوە کـە قائیمقامـی خانەقیـن عەبدوڵـڵا بـەگ دووبـارە بچێتـەوە دلیـم، قائیمقامـی هندیـە راسـخ و قائیمقامـی هەولێـر مسـتەفا سـالم و قائیمقامـی دلیـم ئەدیـب ئەفەنـدی بگۆردرێنـەوە، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی بەغـداد داواکاری و تەلەگـراف نێـردراوە، قائیمقامـی هندیـە بـۆ هەولێـر بچێـت و لـە مەرکـەزی لیـوا کـە کەرکووکـە لەگـەڵ خێزانەکـەی لـەوێ چـاوەڕێ بـکات. بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە هاتـووە، ئەوانی تریـش کـە ناویـان هاتـووە بچنـە ئـەو شـوێنە نوێیانـەی کـە بۆیـان دیـاری کـراوە، لـە شـوێنی خۆیـان نەمێننـەوە، چونکـە زیانـی دەبێـت، عەبدوڵـڵا بـەگ لـە خانەقیـن بمێنێتـەوە، قائیمقامـی هندیـە راسـخ ئەفەنـدی بچێتـە هەولێـر و قائیمقامـی هەولێـر مسـتەفا سـالم ئەفەنـدی بـۆ دلیـم و قائیمقامـی دلیـم ئەدیـب ئەفەنـدی بـۆ هندیـە بگوازرێنـەوە ئەمـەش لـە هەمـان داواکاری و تەلەگـراف ئامـاژەی پـێ کـراوە.





DH.TMIK.M.00120.00024.001

| DH.TMIK.M | 00120.00024 | 27 زیلقەعدە 1319 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
چەتەی شێخ بزێنی تا گەیشتوونەتە گوندەکانی دەورووبەری شارۆچکەی هەولێر و کۆی سانجەق، کاروانەکانیان تاڵان کردووە، ئەو پۆلیسی پاراستنانەی کە دەنێردرێن، وەکو هێزی پاڵپشت ١٠٠ تا ٨٠ سەربازیشیان لەگەڵ ڕەوان بکرێت، لە موتەسەرفی کەرکووك ئاماژەی پێکراوە، لە قائیمقامەکانی کۆی سانجەق و هەولێر لەگەڵ فەرمانبەرانی پۆلیسی پاراستن داوای نووسراو و زانیاری کراوە و بە ناردنی پیاوی تایبەت لێکۆڵینەوە کراوە، لە هەمەوەندەکان عەبدولکەریم و لە هۆزی شێخ بزێنی ئەسعەد و براکەی بە ناوی تۆفیق ١٢ ئێستر بردراوە، بەڵام بە گەرانەوەیان دراوەتەوە خاوەنەکانیان، بە پێویست نازانرێت مەفرەزەیەکی ١٠٠ کەسی بنێردرێت.
ڕەشید والی موسڵ



Y.MTV.00217.00041.001

| Y.MTV | 00217.00041 | 5 ڕەبیعی یەکەم 1319 |
| --- | --- | --- |

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی
لە کەرکووک وێنەی تەلەگرافنامەی بە شیفرە لەلایەن میرلیوا ئەمین پاشا لە ٦ حوزەیران ١٣١٧ ناردوویەتی

لـە سـاڵی ١٣١٤ کاروانـی ئەرزاقـی سـەربازی و کاروانـی بازرگانـی سـلێمانی بـۆ چەمچەمـاڵ ڕۆیشـتووە، بیرۆکـەی کاری تاڵانکردنیـان هەبـووە، لـە بەرامبـەر سـەربازی شـاهانەش چەکیـان بەکارهێنـاوە، یـەك کـەس شـەهید بـووە و دوو کەسـیش برینـدار بـووە، لەگـەڵ قوماندانیەتـی میرلیـوا یوسـف پاشـا یـەك مەفـرەزە بـە فەرمانـی پاشـا ئەرکیـان پـێ سـپێردراوە تـا تەمبێیـان بکـەن، لـە سـێ سـاڵ لەمەوبـەر بـە هەمـوو شـێوەیەك لـە دەسـتگیرکردنیان سـەرکەوتوو نەبوونـە، چەتـە عەزیـز شـوانی ئەمجـارە بـە نهێنـی هاتۆتـە کەرکـووك، لـە دوای لێکۆڵینـەوە بـە موتەسـەرفیەت ڕاگەیەنـدراوە و مەفـرەزەی ژاندارمـە ڕێکخـراوە، جگـە لەمـە مەفرەزەیەکـی نیزامیـەش ڕێکخـراوە و خراوەتـە پـاڵ یەکـتر و نێـردراون، شـوێنەکەیان ئابلۆقـە داوە، هـەروەك بیـنراوە بـە چـەك بەرامبەریـان وەسـتاون و هێرشـیان کردۆتـە سـەریان، بـەڵام لـە سایەی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـۆ یـەك ڕۆژیـش بێـت ڕووداوی نەشـیاو ڕووینـەداوە و ڕێگەیـان پـێ نـەدراوە پـێ درێـژی بکـەن، ناوبـراو لەگـەڵ خیانەتکارەکانـی تـر لـە هاوەڵانـی بـە نـاوی چەتـە عوسـمان و سـادق و ئەحمـەد ئەسـعەد دەسـتگیرکراون و ٦ تفەنگیـش دەسـتی بەسـەر داگیـراوە لەگـەڵ زیاتـر لـە ٤٠٠ فیشـەك لەگـەڵ ئەوانـەش ئـەو کاتژمێـرە هاورێکانیـان کـە لـەوێ نەبوونـە ١٣ سـەر ئەسـپ و کەلوپەلەکانیـان کەوتۆتـە دەسـت و رادەسـتی حکوومـەت کـراوە، لـەم بارەیـەوە هیممەتـی موتەسـەرفی کەرکـووك عوسـمان پاشـا شـایەنی بـاس کـردن و ڕێزلێنانـە، لەگـەڵ ئەمـەش بـە شـێوەیەکی گشـتی نـزا و پارانـەوەی دانیشـتوان بۆتـە هـۆی سـەرکەوتنەکە.

OSMANLI ARŞİVİ
DH.ŞFR
263 18

DH.ŞFR.00263.00018.001

| DH.ŞFR | 00263.00018 | 21 ڕەبیعی کۆتایی 1319 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
یەکەم و دوا ڕاگەیەندراوی بەندەمان کە ڕاگەیەندراوە، دەرکەوتووە لە ڕووداوەکانی ڕانیە هەندێك لە هۆزەکانی لای ئێرانیش کۆبوونەوەیان کردووە و بیرۆکەی ئەوەیان هەیە هێرش بکەنە سەر ئەندامانی شکۆدار، بۆ پەرشوبڵاوکردنەوەی ئەمانەش مەفرەزەیەکی نیزامیە ئەرکیان پێ سپێردراوە، لە سەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك، هەر ئێستا مەفرەزەکە ئامادە بکرێت تا کار لەسەر ئاشتکردنەوەی نێوان ئەم دوو هۆزە بکەن و ڕێگە نەدرێت ڕووبەڕووبوونەوە روو بدات، بۆیە هەر ئێستا قوماندانی فرقەی نیزامیەی هومایۆنی کەرکووك دەست بە کار بێت، بە گوێرەی ئامادەکاری خۆچێی ئامادەکاری بەپەلە بکرێت و هەردوو کۆمەڵە پەرشوبڵاوبکرێنەوە، لە وەڵامدا بۆ موتەسەرفی ناوهاتوو نووسراوەتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگە نەدرێت ئەندامان و هۆزەکان لەلایەنی ئێرانەوە بپەڕنەوە ئەم لایە، ئاگاداری دراوەتە باڵیۆزخانەی ئێران، بۆ ئەمەش تکا کراوە پەیوەندیداری نەزارەت هاوکار بێت، زانیاری تێروتەسەل وەربگیرێت و ئەنجامەکەی ڕابگەیەندرێت، فەرمان.
نازم والی موسڵ

DH.ŞFR.00264.00021.001

| DH.ŞFR | 00264.00021 | 16 جەمادی یەکەم 1319 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە ١٦ ئۆغسـتۆس ١٣١٧، ئەندامانـی ئـەو تابـورەی لـە چەمچەماڵـە لەگـەڵ هـۆزی هەمەوەنـد تووشـی ڕووبەڕووبوونـەوە بوونەتـەوە، بـە ئامـاژەی موشـیرەتی شـکۆدار بـە هـەواڵ ئـەو تابـورە لەگـەڵ تابورەكـەی تـر بگۆردرێنـەوە، فەرمانیـش بـۆ ئـەم مەبەسـتە دراوە، هەروەهـا ئـەو كەلوپەلەلانـەی كـە دزراون بەشـێكی گەڕێندراوەتـەوە، بەشـەكەی تـری كـە مـاوە پەلـە بكرێـت لـە وەرگرتنـەوەی، هەروەهـا لـە بـارەی ڕووداوەكـە لەلایەنـی مولكیـە و سـەربازیدا فەرمانبـەر نێـردراوە بـۆ ئـەوەی بـە هاوبەشـی لێكۆڵینـەوە ئەنجـام بـدەن و ئەنجامەكـەی ڕابگەیەنـن، بـۆ موتەسـەرفی كەركـووك و فرقـەی قوماندانیـەت ئامۆژگاری پێویسـت دەركراوە، هێشـتا ئەنجامـی لێكۆڵینەوەكـە ڕانەگەیەنـدراوە، ئەمجـارەش دوای دڵنیابوونـەوە ئاسـاییە ئەنجامەكـەی ڕابگەیەندرێـت.
والی موسڵ

| 26 رەبیعی کۆتایی 1319 | 001688.126531 | BEO |
| --- | --- | --- |
| بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قۆمیسیۆنی مامەڵەی بە پەلە<br>ژمارە ٢٢١٧<br>بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>وەکیلی قائیمقامی رانیە سەید ئەحمەد ئەفەندی گوێ لە ئامۆژگاری ناگرێت و ئەم کەسانەی کە لە لای خۆی کۆی کردوونەتەوە لە سەرپێچی کردن بەردەوامن و هێرشیان کردۆتە سەر گوندێك و سووتاندوویانە، بە تەواوەتی مەروماڵات و کەلوپەلیان تاڵان کردووە، هەروەها ٦٠ کەسیان کوشتووە، بە ئاماژەی موشیرەتی شکۆدار لەلایەن والای سەرعەسکەر راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، هەر هێستا ناوبراو دەستگیر بکرێت و بە گوێرەی یاساش لەسەر ئەو سەرپێچی و زوڵمەی کە کردوویەتی دادگایی بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت لەسەر نووسراوی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیدارانی سەدارەت دەرچووە ئاگاداری دراوەتە ویلایەت، کە کاری پێویست بکرێت، تا بدرێتە دادگا، هەروەها لەسەر ئەم فەرمانەی کە لە وەکالەتی موشیرەتی ناوهاتوو دراوەتە قوماندانی فرقە لەلایەن سەربازیەوە دەستپێشخەری کراوە لە دەستگیرکردنی ئەحمەد ئەفەندی، بەڵام نەتوانراوە دەستگیر بکرێت، لەم شەڕەی کە کراوە ٦٠ کەس کوژراوە، بەڵکو لە هەردوو لایەن ١٨ کەس کوژراوە و ١٠ برینداریش هەیە، لەم رووداوەدا قادر رانیەیی لەگەڵ هاورێکانی سەید ئەحمەدی ئەفەندی ناوبراو و حەفید شێخ مەعروف ئەفەندی لە سەیدەکانی بەرزنجی بە چەك رێگایان گرتوون و لەوێ و لە کۆی سانجەق جۆرەها سوکایەتیان پێ کردوون، لەم کاتەی کە بە پێویست زانراوە ئەحمەد ئەفەندی و قادر و هاورێکانی پەرشوبڵاوبکرێنەوە، کەچی بە پێچەوانەوە هێزێکیان دروست کردووە ١٥٠٠ کەسیان کۆکردۆتەوە، لە وەکالەتی ناوهاتووەوە تەنیا ئەحمەد ئەفەندی خراوەتە ژێر چاودێری و بەدواداچوونەوە، لە بارەی ئەوانی تر بەهۆی بوونی بیروڕای دژی یەك جگە لەمە لە کاتی دووبارە کردنەوەی رووداوەکان ئەوا قادر و هاورێکانی کە پێك هاتووە لە محەمەد سەرۆکی هۆزی پشتکلی لەگەڵ رێکخەری راستەقینەی رووداوەکە حەمە ئاغا و رەسول ئاغای کۆی سانجەقی دەستگیر دەکرێن، لەگەڵ ئەحمەد ئاغا بەیەکەوە لە کەرکووك دادگایی دەکرێن، مامەڵەی یاساییان لەگەڵ دەکرێت، هێشتا بۆ دەستگیرکردن و رادەست کردنیان هەواڵ دراوەتە موشیری ناوهاتوو بەم شێوەیە لە بارەی هەردوو لاوە مامەڵەی یەکسان ئەنجام بدرێت، رێگە نەدرێت رووداوی نابەجێ روو بدات، بە هاتنی ئەمانە بۆ کەرکووك ئەحمەد ئەفەندیش خۆی لە خۆیدا دێت و بۆ رێگەگرتن لە رووبەرووبوونەوە لەلایەنی سەربازیەوە بینباشی سلێمان ئەفەندی نێردراوە، دوای گەیشتنی بە شایەتحاڵەکان لێکۆڵینەوەکە بە تەلەگرافنامە لەگەڵ کاغەزی گرنگ بە پۆستە دەنێردرێت، لە وەکالەتی ویلایەتی موسڵ و بەهۆی ئەم رووداوانەوە هەندێك هۆز کۆبوونەوەیان کردووە لە ئێرانیش ئەندامیان هێناوە لە بیرۆکەی هێرش کردنن، هەروەها بۆ پەرشوبڵاوکردنەوەی ئەمانە بە موتەسەرفی کەرکووك راگەیەندراوە کە ئەو مەفرەزە نیزامیەی ئەم ئەرکەیان پێدراوە کەمن، بۆ زیاد کردن و بەهێز کردنی مەفرەزەکە شتێك نەکرێت پێچەوانەی یاسای عالی بێت، بە قوماندانیەتی نیزامیە و ئامادەکاری پێویست بکرێت بۆ پەرشوبڵاوکردنەوەی هەردوو کۆمەڵە بۆ موتەسەرفیەت نووسراو کراوە، بە راگەیاندنی بۆ رێگەگرتن لە هاتنی ئەندامانی ئەم هۆزانە لەلایەنی ئێرانەوە، ئەوا ئاگاداری لە ویلایەتی ناوهاتوو دراوە تا ئاگاداری بدرێتە باڵیۆزخانەی ئێران، جگە لەمە بۆ چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کارەکەش لە نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار دەرچووە، لەم بابەتە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ | | |



| 22 ڕەبیعی یەکەم 1319 | 00993.00068 | ŞD |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکان خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١١٧٠
بـاش کاتیبـی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك عەبدولرەحـمان بـەگ کۆچـی دوایـی کـردووە، لەلایـەن خێزانەکـەی فاتیمـە و کچەکانـی ئامینـە و جەمیلـە و فەهیمـە خانـم و کوڕەکـەی محەمـەد عومـەر ئەفەنـدی داواکاری پێشـکەش کـراوە و داوای مووچـە دەکـەن، لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو دەرچـووە لەگـەڵ داواکاری و خشـتەی مـاوەی خزمـەت و ئەوراقـی پابەنـد بـەم بابەتـە لـە ژمێریـاری ڕێکخـراوە و پۆسـتەی دەرکەناریـش لـە دەسـتەی گشـتی و لـە پۆسـتەی ناوهاتـوو مێـژووی ئـەرك و بـری مووچەکـەی ووردبینـی بـۆ کـراوە، لـە ٦ شـوبات ١٣١٥ مـردووە و بـە گوێـرەی بریارنامـەی فەرمانبـەران مـاددەی ٣٥ و ٣٦ و ٣٩ مامەڵـەی لەگـەڵ دەکرێـت، لـە سـندوق نـووسراوی بـۆ کـراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.



| 10 جەمادی یەکەم 1319 | 001709.128161 | BEO |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمارکردن
بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
جەنابی ئەفەندم
دوو سێ مانگ پێش ئێستا ئەو کارە چەتەییانەی کە لە قەزاکانی رانیە و کۆی سانجەق ئەنجامیان داوە و بۆ ئەوەی رێگە نەدرێت بە هاوبەشی کارەکە بکەن، لە شارۆچکەی کۆپری لەگەڵ دانیشتوانی گوندی دەورووبەر هەواڵ هاتووە توندڕەوەکانی بزێنی دەیانەوێت هێرش بکەنە سەر دانیشتوانی ناوهاتوو، ئەگەرچی ئامۆژگاری پێویست دراوە، بەڵام قەبوڵیان نەکردووە، لە کاتی رووبەڕووبوونەوە لە چەتەکان سێیان کوژراوە و چواریشیان بریندار بوونە، هەروەها دوانزەشیان بە زیندوویی دەستگیر کراون، ئەوەی ماوەش چاودێری دەکرێن، جگە لەمە ئامۆژگاری کاریگەر و پێویست دراوەتە سەرۆکی توندڕەوەکان و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە بکرێت کە لە رووبەڕووبوونەوەکە ناچار بوونە چەك بەکار بهێنن، ئامادەکاری پێویست ئەنجام دەدرێت، ئەو ئەفسەرەی کە لە لایەنی سەربازیەوە دادەمەزرێت، لەگەڵ ئەم ئەفسەرە بۆ شوێنی مەبەست بڕۆن، بۆ ئەمەش ئاگاداری دراوەتە موتەسەرفی کەرکووك، بە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ راگەیەندراوە و ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار، لە سەرعەسکەری والاشدا جێبەجێ دەکرێت، فەرمانی ئەفەندیمە.



| 21 زیلحیجه 1319 | 001820.136478 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار

بـۆ باشـکردنی بارودۆخـی ئێسـتای سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیدارانـی خەلافـەت هێـزی سـەربازی رێکخـراوە، بـۆ خەرجـی پێداویسـتی گەشـتەکەیان و خەرجـی رۆیشـتنیان هـەر ئێسـتا دابیـن بکرێـت، هەروەهـا بـە رێـك نەخسـتنی خەرجیەکـە فەرمانـی چاکسـازیەکە کێشـەی تـێ دەکەوێـت، بەڵکـو هێنانـی ئەوانـە بـۆ دەشـتایی و لەگـەڵ ئـەو رەدیفانـەی کـە دەهێنرێـن چەکیـان پـێ دەدرێـت، چاوەڕێـی ئەنجامدانـی کاری پێویسـت دەکـەن، هەروەهـا کاروکـردەوە چەتەیـی و ئاژاوەگێـری هەمەوەنـد و پشـدەریەکان زیـاد دەکات، بـە تەواوەتـی لـە خۆبایـی دەبـن، بـۆ ئـەم کارە میـری میـران موحسـین پاشـا ئەرکـی پـێ سـپێردراوە، تەلەگرافنامـە لەلایـەن ناوبـراوەوە نێـردراوە و ئامـاژەی پێکـراوە، بـە نـووسراوی سەرعەسـکەر لـە مێـژووی ١٩ زیلحیجـە ١٣١٩ ژمـارە ١٥٣ جێبەجـێ دەکرێـت، بـە پەلـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت هەروەهـا هاوپێچەکانـی بنێردرێتـەوە.



| 27 زیلحیجە 1319 | 001823.136709 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٣ زیلحیجە ١٣١٩، بۆ چاکسازی بارودۆخی ئێستای سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی، بریار و فەرمانی همایۆنی شاهانە رێکخراوە، لە هێزی سەربازی ئەو تابورە نیزامیەی کە لە موسڵە فەرمان دراوە بۆ کەرکووك جولە بکات، خەرجیەکەی رێکنەخراوە، بۆیە جولەیان نەکردووە، هەروەها داهاتی تابورەکانی رەدیف کە حەواڵە کراوە، ئەوەی وەریگرتووە نەیناردووە، ئەمەش وایکردووە رۆیشتنیان دوا بکەوێت، بۆیە فەرمانی دابین کردنی داهاتی تابورەکانی رەدیف بە پەلە داهاتەکە بنێردرێت و بۆ چاکسازیەکەش ئەو تابورە نیزامیەی کە بۆ بازیان جولە دەکات، بۆ رۆیشتنیان بڕە پارەکەیان دابین بکرێت، لە وەڵامدا لە مێژووی ٢٤ زیلحیجە ١٣١٩ ژمارە ٢١٥ هاوپێچ نووسراوی عالی سەرعەسکەر، بە ئاماژەی موشیرەتی لەشکری شەشەمی همایۆنی شکۆدار روون و دیارە، هەروەها بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت، هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی کارەکە و راگەیاندنی و ناردنەوەی هاوپێچەکانی.



| 10 رەبیعی کۆتایی 1319 | 001886.141399 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك عوسـمان پاشـا دوورخراوەتـەوە، بـە دوورخسـتنەوەی لـە ئەرکەکـەی لـە شـوێن ئـەو موتەسـەرفی عەمـارە ئیبراهیـم موخلّیـس دادەمەزرێـت، لـەم بارەیـەوە لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ١٦ رەبیعـی یەکـەم ١٣٢٠ ژمـارە ١٩٢ بـە بڕیـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت لـە مێـژووی ٨ رەبیعـی کۆتایـی ١٣٢٠ بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان داوە، هەروەهـا ناوبـراو لـە شـوێنی خـۆی لەسـەر هەندێـك کێشـە لەگـەڵ والیەکانـی تـر کێشـەی هەبـووە، بۆیـە لەسـەر ئـەم سـکاڵایانەی کـە لەسـەریەتی، ناوبـراو ئـاگادار بکرێتـەوە کـە دووبـارەی نەکاتـەوە، نـووسراوی قۆمیسـیۆنی ناوهاتـوو باسـکراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.




DH.MKT.02532.00103.001

| DH.MKT | 02532.00103 | 1 جەمادی کۆتایی 1319 |
|---|---|---|

بۆ سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار

ئەم ئەرکانەی کە بە بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووک حالەت ئەفەندی سپێردرابوو بە تەواوەتی ئەنجامی داون، لەم بارەیەوە وێنەکانی بە نووسراوی ویلایەتی موسڵ لە مێژووی ٢٨ تەمموز ١٣١٧ ژمارە ٥٥ نێردراوە، هەروەها مامەڵەی تۆماری دەرکەوتووە داواکاریەکانیش نێردراون.



| DH.MKT | 02562.00106 | 17 شەعبان 1319 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
رزا ئەفەنـدی بـۆ مـاوەی سـاڵێك وەکـو فەرمانبـەری ناسـنامە لـە قـەزای رانیـە بـە ڕێکوپێکـی کارەکـەی ئەنجام داوە، بـەڵام دواتـر لەگـەڵ کەشـوهەوای ئـەوێ نەگونجـاوە و بـە لێبـووردن لـە سـەرەتای سـاڵی ١٣٠٣ لە تۆماری ناسـنامەی سـانجەقی کەرکـووك دامـەزراوە، ئەگەرچـی ئەمـڕۆ لـە ئەرکەکـەی بەردەوامـە، بـەڵام مووچەکـەی بەشـی خێزانەکـەی و بەشـی بژێـوی ژیانـی نـاکات، بۆیە لەلایەن کاتیبی ناسـنامە رزا ئەفەنـدی داواکراوە لـە ویلایەتی بەهیە ئەرکـی ناسـنامەی لیوایەکـی پـێ بدرێـت و دابمەزرێـت، لەلایـەن کاتیبـی ناسـنامەی لیـوای ناوهاتـوو رزا ئەفەنـدی داواکاری نێـردراوە، لـە کیتابەتـی ناوهاتـووش لـە ژێـر دەسـتی ئەمیـن ئەفەندییـە، سـەبارەت بـە دامەزراندنـی رزا ئەفەنـدی بـۆ تۆمـار زانیـاری نییـە، سـەیری بابەتەکـەی دەکرێـت، بـۆ دامەزراندنـی ناوبـراو مامەڵەکـە حەواڵـەی تۆماری ناسـنامە کراوە، لـە کارگێری گشـتی قسـەی لەسـەر کـراوە، جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت.



| DH.MKT | 02572.00009 | 19 رەمەزان 1319 |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>لـە بەڕێوەبـەری ناحیـەی دیـرە عەریـف سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك دامـەزراوە و لـە دەرچووانـی مەکتەبـی سـوڵتانیەیە، کوڕەکـەی یوسـف زیـا ئەفەنـدی لوملـی لـە مـاوەی ١٠ مانگـەوە هەواڵـی وەرنەگرتـووە، بـۆ ئـەوەی هەواڵـی مـردن و زیندووبوونـی وەربگرێـت لـە دانیشـتوانی لـوم ئیبراهیـم حوسـێن داواکاری بــە واژوو لەگـەڵ وەرگرتنـی نـووسراوی بریـکاری قـەرزی بازرگانـان هاوپێـچ نـووسراوی مێـژووی ٢٧ تشرینـی دووەم ١٣١٧ ژمـارە ٧٠٠ی نەزارەتـی دەرەوە ئامـاژەی پێکـراوە، بـە لێکۆڵینـەوە هـەواڵ رەوان بکرێـت. | | |



DH.MKT.02582.00125.001

| 23 شەوال 1319 | 02582.00125 | DH.MKT |
| --- | --- | --- |

قەڵەمی تۆمارکردنی ناوەخۆ
بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لـە مەرکـەز و پاشـکۆکانی سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، ئەفسـەر و پۆلیسـی پاراسـتنی نیزامیـە و رەدیـف ئـەو بـڕە پارانـەی دەسـتیان کەوتـووە نزیکـەی ۳۰۰۰۰۰ قـوروش دەبێـت، لەمـە ئاقچەیـان خسـتۆتە سـەر نـاوی خۆیـان، بـە ڕاگەیاندنـی بوونـی داواکاری سـاڵانی ڕابـردوو، ئەگـەر سـەیری داهاتـی ئـەم سـاڵە بکرێـت، ئـەوا ئـەم پارەیـە لەسـەر داواکاران هەژمـار بکرێـت و لەسـەر داواکـردن و ڕاگەیاندنـی ئـەو پارەوپولـی میریـەی کـە لـە ژێـر دەسـتیانە دەسـت بەسـەر بکرێـت، هەروەهـا ئـەم حاڵـە لەسـەر گشـت فەرمانبـەران هەژمـار کـراوە، ئەمـەش وایکـردووە تۆمـار و مامەڵـەی سـندوقی دارایـی تێـك بـدات و ئـەوەی لـە خەزینـە ڕێکخـراوە ناردنـی دواکەوتـووە، لـەم بابەتـەدا ئـەو ئاگاداریانـەی کـە نێـردراوە هیـچ سـوودێکی نەبـووە، لـە پشـکێنەری دارایـی ویلایەتـی بەهیـە ڕاگەیەنـدراوە و بـە واڵای سەرعەسکەریشـمان ووتـراوە، بـەم ڕاگەیەنـدراوە لـە نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار بـە پەیوەندیدارانـی سـەدارەت ڕاگەیەنـدراوە و نـووسراو لـە مێـژووی ۹ کانوونـی دووەم ۱۳۱۷ باسـکراوە و پێشـکەش کـراوە، ئـەوەی جێگـەی تێروانیـن و ووردبینیـە دەبـێ بەپەلـە هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.




DH.MKT.02585.00036.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02585.00036</td><td>27 شەوال 1319</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ٣ کانوونـی یەکـەم ١٣١٧ ژمـارە ٨٠٥، خەرجـی بونیادنـان و نۆژەنکردنـەوەی قۆناغەکانـی حکوومـەت لـە داهاتـی ناوەخـۆ جێبەجـێ دەکرێـت، بۆیـە نۆژەنکردنـەوەی قۆناغـی حکوومەتـی سـانجەقی کەرکـووك و فەرمانگـەی ژمێریـاری و بـاج لـە داهاتـی ناوهاتـوو نـۆژەن دەکرێتـەوە، بـەڵام لـە ڕێکخـراوی هەژمـاری بینایـە و نۆژەنکردنـەوە جگـە لـەوەی لـە داهاتـی ناوەخـۆ جێبەجـێ دەکرێـت لـە هەمـان کاتـدا دەبـێ بەرامبـەر ئـەم خەرجیانـە ئاقچـە بگوازرێتـەوە و زیـادەی بخرێتـە سـەر، ئـەم کارەش نەکـراوە، بۆیـە هـەر فەرمانگەیـەك خەرجـی خـۆی لـە داهاتـی دابینکـراوی خـۆی دابیـن دەکات و لـە ڕێنمایـی بوودجـەی یاسـایی هەرچـی فەرمانگـەی ژمێریـاری و باجـە بـە تایبەتـی ئەوانـەی پەیوەسـتە بـە نیشـتەجێ کردنـی فەرمانبەرانـی دارایـی خەرجـی ناوبـراوان بـە پشـت بەسـتن بـە ڕێنماییەکانـی یاسـایی پێویسـتە لـە خەزینـەی شـکۆدار دابیـن بکرێـت، بـە ڕاگەیاندنـی ژمێریـاری نـووسراو کـراوە.</td></tr>
</table>



DH.MKT.02591.00116.001

| 14 زیلقەعدە 1319 | 02591.00116 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>شـەوقی ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری ناحیـەی سـوڵتانیەی سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك لەگـەڵ بەڕێوەبـەری ناحیـەی کیـل بـە نـاوی ئەحمـەد فەریـد ئەفەنـدی لـە ئەرکەکانیـان گۆڕینەوەیـان پـێ کـراوە، لـە مێـژووی دەسـت بـە کار بوونیـان لـە ئەرکـە نوێیەکانیـان و بـە گەیشـتنیان بـۆ ئـەوێ لـە ناوبـراوان شـەوقی ئەفەنـدی مانگانـە ٥٤٠ و ئەحمـەد فەریـد ئەفەنـدی ٥٨٣ قـوروش مووچەیـان بـۆ دەبردرێتـەوە، هەروەهـا ئەحمـەد فەریـد ئەفەنـدی مووچەکـەی بـەرز دەکرێتـەوە و هەردووکیـان لـە کاتـی دووچاری تەنگانـە بوونیـش ئـەوا بـە گوێـرەی ڕێنمایـی یاسایی کار دەکرێـت و لـە کاری پێشووشـیان دەسـت لـە کار دەکێشـنەوە و مێـژووی دەسـت لـە کارکێشـانەوەیان لـە ژمێریـاری ئامـاژەی پێکـراوە، هەروەهـا بـۆ بەڕێوەبەرایەتـی بـەرواری بـاڵا عەبدولحەلیـم ئەفەنـدی دامـەزراوە، بـەم تێڕوانینـەوە پێویسـت نـاکات لـە ئاغاکانـی دزەیـی ئەحمـەد ئاغـا بـەکار بهێنرێـت. | | |




DH.MKT.02594.00033.001

| DH.MKT | 02594.00033 | 19 زیلقەعدە 1319 |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٢ تشرینی یەکەم ١٣١٧یە، قائیمقامی پێشووی رواندز عەزیز سەبری هەروەها بەرێوەبەری پێشوو و ئەمینی سندوقی قەزای ناوهاتوو هەردوو ئیسماعیل ئەفەندی لە بارەی فەرمانبەرانی ئاماری مەرومالات لە سانجەقی کەرکووک لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە، سەرەتا ئەم ئەوراقانەی کە پێشکەش کراوە، رێك بخرێن، بۆیە ئەمجارە لە ویلایەتی موسڵ نووسراوی مێژووی ١٥ کانوونی دووەم ١٣١٧ ژمارە ١٣٣ لەگەڵ ئەوراقی لێکۆڵینەوە بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت نێردراوە.



| 23 زیلقەعدە 1319 | 02594.00126 | **DH.MKT** |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی پایەبەرز
ئـەم کاتـەی بەڕێوەبـەری توزخورماتـو بـووە لـە ئەرکەکـەی سـەرکەوتوو نەبـووە، بۆیـە لەگـەڵ بەڕێوەبـەری ناحیـەی باڵـەك گۆرینەوەیـان پـێ کـراوە، بۆیـە دووچـاری زیـان و زوڵـم بۆتـەوە و لەبـەر ئـەوەی زمانـی ناوچەکـەش نازانێـت، مـاوەی دوو سـاڵە بـە وەکالـەت ئەرکەکـە بەڕێـوە دەبـات، بۆیـە داوای کـردووە لـە بەڕێوەبەرایەتـی ناحیـەی داقـوق دابمەزرێـت و بـە مـۆری عەلـی رزا بەڕێوەبـەری ناحیـەی باڵـەك داواکاری نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە هاوپێچەکـەی و زانیـاری خۆچێـی، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـەی.




DH.MKT.02600.00010.001

<table>
<tr><td>19 زیلحیجە 1319</td><td>02600.00010</td><td>DH.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>٥<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی ئەفەندم<br>لـە مەرکـەزی ویلایـەت هاوپێـچ خشـتەی رووداوەکانـی سـاڵی ١٣١٧ مانگـی شـوباتی قەزایەکانـی سـنجار و دهـۆك و عەقـرە، هەروەهـا مانگـی کانوونـی دووەم و شـوباتی قـەزای زاخـۆ و مانگـی کانوونـی دووەم و شـوباتی قـەزای رانیـەی سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك، مانگـی شـوباتی قەزایەکانـی هەولێـر و روانـدز و سـەڵاحیە و کـۆی سـانجەق پێشـکەش کـراوە، ئەگەرچـی لـە رووداوە ناوهاتـووەکان هەندێکیـان لـە جـۆری ئـاژاوە بـووە، پێویسـت نـاکات لـە خشـتەکە بنووسرێتـەوە، بـەڵام لـە پاشـکۆی ئەرکەکـەی ئێرەیـان بـە شـێوەیەکی شـایان جیانەکردۆتـەوە، پێویسـتە بـە گشـتی ئـاگاداری بنێردرێـت، لـەم بابەتـە بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.</td></tr>
</table>



DH.TMIK.M.00138.00012.001

| DH.TMIK.M | 00138.00012 | 29 شەوال 1320 |
| --- | --- | --- |

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
٢٨٣٨
راگەیەندراوی بەندەیە
ئاغاکانی کۆی سانجەق لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاوەکانی سەرەتا گوندەکانیان سووتاوە و ٤٠ تا ٥٠ کەسیان کوشتوە، پارەوپول و مەروماڵاتیان تاڵان کردووە، بۆیە دوای ئەوەی حەمە ئاغای کۆی سانجەق لە کەرکووك یەك دوو مانگ زیندانی کراوە، ئێستا لە ژێر چاودێری نەزارەتە، لەسەر گفتوگۆکردن لەگەڵ ئاغاکانی تر هێرشی کردۆتە سەریان، دووبارە هێرشی کردۆتە سەر گوندەکانی هۆزی دیزەیی و هەندێك لە تاکەکانی کوشتوە و ئەو سەربازە شاهانانەی کە پارێزگاریان بوونە، یەکێکیان شەهید کردووە، بۆ ئەم مەبەستە سەرۆکی شێخ بزێنی عەبدولوەهاب ئاغازادە رەشید و پێنج کەس لە هاوەڵانی تەلەگرافنامەیان واژوو کردووە و لە سلێمانی دەرچووە، لەسەر فەرمانی سەدارەت هاوپێچ پێشکەش کراوە، لەم بارەیەوە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
رزا سەرعەسکەر


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.TMIK.M
138 | 23 | 1

DH.TMIK.M.00138.00023.001

| 1 ڕەمەزان 1320 | 00138.00023 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
تەلەگرافنامەی بە شیفرەیە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
لەگەڵ ووتەی ویلایەتی وان باڵیۆزی ئینگلیز لە وان دێتە موسڵ، حاڵی حازر هاتۆتە رواندز لەوێشەوە لە ڕێگەی رانیە و کۆی سانجەق جولەی کردووە، وەرگێرەکەشی هاتۆتە هەولێر، بە ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووک هۆکاری سەلامەتی و پاراستنی بۆ ئەنجام دەدرێت، جموجۆڵیشی دەخرێتە ژێر چاودێریەوە، لە وەڵامدا نووسراوەتەوە، زانیاریەکان ڕاگەیەندراوە، فەرمان.
نوری والی موسڵ



DH.TMIK.M.00140.00019.003

| 3 زیلحیجە 1320 | 00140.00019 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە سـانجەقی سـلێمانی سـەیدەکانی جەبـاری لەگـەڵ تاڵەبانیەکانـی کەرکـووك رووبـەرووی یەکـتر بوونەتـەوە و لـە نێوانیـان شـەڕ روویـداوە، تەنانـەت لەلایـەن تاڵەبانیـەکان دوو پیـاوی جەباریـەکان کـوژراوە، بۆیـە لـە نێوانیـان ناکۆکیەکـە پـەرەی سـەندوە، هـەردوو لا خەریکـی کۆکردنـەوەی کۆمەڵـەن و خۆیـان ئامـادە دەکـەن هێـرش بکەنـە سـەر یەکـتر، ئـەم ئاماژەیـە لـە موتەسـەرفیەتی سـلێمانی هاتـووە، بۆیـە بەپەلـە ئامادەکاری بکرێـت و هـەر ئێسـتا کارێـك بکرێـت ئـەم دوو کۆمەڵەیـە پەرشـوبڵاو بکرێتـەوە، رێگـە نەدرێـت ئـەم ناکۆکیـە پەرەبسـەنێت، جەنابـی موحسـین پاشـا لەگـەڵ موتەسـەرفی کەرکـووك بـە شـێوەیەکی گرنـگ بـۆ سـەروو و بـۆ سـلێمانی نـووسراو کـراوە، راگەیەنـدراوە فەرمـان.
نوری والی موسڵ

DH.ŞFR.00283.00059.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR</td><td>00283.00059</td><td>25 موحەررەم 1320</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>دوای رووداوە راگەیەندراوەکان، فرقەی قوماندانیەت بۆ رووداوە راگەیەندراوەکان لەگەڵ هێزی سوارە بۆ کۆی سانجەق دەڕۆن و روو دەکەنە ناوچەکە، زانیاری رادەگەیەندرێت فەرمان.<br>عوسمان موتەسەرفی کەرکووک</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00283.00093.001

DH.ŞFR.00283.00093.001

| DH.ŞFR | 00283.00093 | 28 موحەررەم 1320 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
دوای هاتنی هەواڵێکی زۆر موتەسەرفی کەرکووک لە یەکەم رۆژ دەستی بە جولە کرد و ئەم بەیانیە، بەرەو کۆی سانجەق کەوتە رێ، موحسین پاشا ٣٨٠ سوارە و یەك تابوری سەربازی بەیەکەوە ناردووە، بەڵام پێش ئەوەی ناوبراو بگاتە شوێنەکە لە نێوان هۆزەکان رووبەرووبوونەوە روویداوە، دوای رووبەرووبوونەوەکەش هەر یەکە کشاوەتەوە شوێنەکەی خۆی، دوای روودانی ئەم رووداوە سەربازەکەیان نەیانزانیوە چی بکەن، ئەگەر بێتو لەسەر ئاماژەی من پاشای موتەسەرف لە کاتی خۆیدا جولەی بکردبوایە و بگەیشتبوایە شوێنەکە رێگە لە رووبەرووبوونەوەکە دەگیرا، قەزاکانی کۆی سانجەق و رانیە بە وەکالەت بە رێوەدەچن، ئەگەر بێتو قائیمقامی لێهاتوو هەبێت، هۆکار نادرێتە دەست بۆ ئەوەی ئەم جۆرە رووداوانە روو بدەن، بۆ ئەوەی ئاسایش بەرقەرار بێت و رێگە نەدرێت ئەم رووداوانە روو بدات، یاریدەدەری ویلایەت حەمدی بەگ رۆیشتووە، راگەیەندراوە فەرمان.
رەشید والی موسڵ


DH.MKT.00480.00044.001

| DH.MKT | 00480.00044 | 7 موحەررەم 1320 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
وەڵامی نووسراوی ٢ شوبات ١٣١٧ ژمارە ١٤٥، بۆ دامەزراندنی رزا ئەفەندی لە تۆماری ناسنامەی سانجەقی کەرکووك و ئەمین ئەفەندی دوورخراوە لە تۆماری ناسنامەی کۆی سانجەق، ناوبراوان لە مێژووی دەست بەکاربوونیان هەر یەکە مانگانە ٢٥٠ قوروش مووچەیان بۆ دابین دەکرێت، لە بارەی جێبەجێ کردن، بە گوێرەی نیزام دەبێت و لەگەڵ فەرمانی سوێند خواردن ئەمین ئەفەندی مامەڵەکەی بە کەفالەت جێبەجێ دەکرێت، هەروەها لە بارەی دەست لەکار هەڵگرتنی ئەوانەی پێش ئەمین ئەفەندی لە کۆی سانجەق وەکو فەرمانبەری ناسنامە کاریان کردووە، لە ساڵی ١٣٠٠ تا مێژووی دامەزراندنی ئەمین ئەفەندی ئەوانەی کاریان کردووە ناوەکانیان و لەگەڵ مێژووی دەست بەکاربوون و دەست لە کارهەڵگرتنیان بە ووتەی ژمێریاری رادەگەیەندرێت.



DH.MKT.00528.00075.001

| DH.MKT | 00528.00075 | 18 رەجەب 1320 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
قائیمقامی پێشووی گولعەنبەر و سەرۆکی جاف مەحموود پاشا لەگەڵ بەڕێوەبەری ناحیەی قەرەداغ شێخ سەعید ئەم برە ژاندارمەیەی کە تۆماریان کردووە، بەکارنەهاتوون، دەرماڵەشیان لە لایەن ناوبراوانەوە بردراوە، بەم تێگەیشتنەوە تۆماریان رەشکراوەتەوە، دیسان دەرماڵەی ژاندارمەکان و ئەم چەکانەی کە وەرگیراوە، هەروەها لە سانجەقی کەرکووك دۆزینەوەی کانزای نەوتی بۆیاغ کەوتۆتە دەست ساڵح پاشا و ئەندامانی ئەنجوومەنی کارگێری ئەحمەد بەگ و خستویانەتە ژێر دەستی خۆیان، بەمەش زیان بە دەوڵەت گەیشتووە، بەم راگەیەندراوە بە مۆری عەبدولفەتاح ئاسف دوو پارچە ئەوراق بۆ لایەنی عالی جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە بکرێت و رابگەیەندرێت.




DH.MKT.00531.00079.001

<table dir="rtl">
<tr><th>DH.MKT</th><th>00531.00079</th><th>5 رەبیعی یەکەم 1320</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>قەڵەمی ژمێریاری<br>ژمارە ٩٥٥<br>هـەر خەرجیـەك پەیوەسـتە بـە هـەر فەرمانگەیـەك بـە گوێـرەی ڕێنمایـی یاسـایی دەبـێ لـە داهاتـی خۆیـدا دابینـی بـكات، ئەمـەش بـە هاوپێـچ کۆتایـی پـێ هاتـووە و نووسراوەتـەوە، بـۆ خەرجـی نۆژەنكردنـەوەی فەرمانگەكانـی ژمێریـاری باجـی سـانجەقی كەركـووك ئـەم بـڕە پارەیـەی كـە هەیـە، بـە پشـت بەسـتن بـە ڕێنمایـی یاسـایی لـە نەزارەتـی دارایـی شـكۆدار نـووسراوی بـۆ كـراوە، لـەم بابەتـەدا پێویسـتە سـەردانی نەزارەتـی ناوهاتـوو بكرێـت، لـە وەڵامـدا ویلایەتـی موسـڵ نـووسراوی بـۆ كـردووە، بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئەم كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات.</td></tr>
</table>



| 23 رەبیعی کۆتایی 1320 | 00556.00030 | DH.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی داد و مەزهەب
بەڕێوەبەرایەتی کاروباری سزا
ژمارە ١٥٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی ئەفەندم
قەزای رانیە سەر بە سانجەقی کەرکووك پزیشکێکی بە بڕوانامەی نییە، هەروەها لە موسڵیش پزیشکی شارەوانی نییە، بۆیە بۆ وەرگرتنی ئەم ئەرکە پزیشکی سەربازی کێشە دروست دەکات، بە گوێرەی یاسا لە کاتی ڕوودانی تاوان، پزیشکی پشکنین پێویستە، ئەگەر نەبێت هەندێك لە مافی گشتی و تایبەتی وون دەبێت، بۆیە لە داواکاری گشتی دادگای ئیستینافی ویلایەتی موسڵ نووسراوی ٦ حوزەیران ١٣١٨ نووسراوەتەوە، پشت بەستن بە بڕیاری یاسا بۆ دڵنیایی پاراستن پێویستە لە هەر شوێنێك پزیشکێکی شارەوانی بنێردرێت و هەبێت، لەم بابەتە بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری داد



DH.MKT.00571.00084.002

| 21 ڕەبیعی یەکەم 1320 | 00571.00084 | DH.MKT |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٦١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی ئەفەندم
لـە بـارەی قائیمقامـی پێشـووی کـۆی سـانجەق عەبدولرەحـمان بـەگ، لێکۆڵینـەوەکان تـەواو بـووە، لەگـەڵ داواکاری ٢٧ مایـس ١٣١٧ ژمـارە ٢٥ پێشکەشـی جەنابـی پەیوەندیـداری نـەزارەت کـراوە، بـۆ گەرانـەوەی ئـەو کاغەزانـە بـە شـایان زانـراوە دەوڵـەت هـاوکار بێـت، لەسـەر ئامـاژەی موتەسـەرفی کەرکـووك و ووتـەی داواکاری گشـتی مولکیـە ڕاگەیەنـدراوە، لـەم بارەیـەوە بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
بە ناوی ویلایەتی موسڵ




DH.MKT.00628.00029.001

| 8 ڕەمەزان 1320 | 00628.00029 | DH.MKT |
|---|---|---|

بابی عالی

٨١٩

بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی عەمارە عەبدولرەحمان ئەفەندی لەگەڵ ئەوەی داوای کردووە ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، جێبەجێ کردنەکەی لە ویلایەتی بەسرا بە نووسراوی ٣ تشرینی یەکەم ١٣١٨ ژمارە ٦٧ ڕاگەیەندراوە، بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك حالەت ئەفەندی بۆ ئەوەی روون بێتەوە ئاخۆ ئەگەر گۆرینەوەی پێ بکرێت، تا چەند زوڵمی لێ دەکرێت و ناکرێت، ئەوا پرس بە ویلایەتی موسڵ کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.




MF.MKT.00669.00045.001

| 11 شەعبان 1320 | 00669.00045 | MF.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی مەعاریفی گشتی
ژمێریاری
ژمارە ٦٤١٩
لـە کارگێـری مەعاریفـی موسـڵ خشـتـەی خەرجـی تشرینـی دووەم ١٣١٧ هاتـووە، لـە کاتـی ووردبینـی کردنـی پـارەی دەسـت بەسـەر، دەرکەوتـووە یاریـدەدەری موعەلیمـی مەکتەبـی روشـدیەی سـانجەقی کەرکـووک محەمـەد رەئـوف ئەفەنـدی مووچـەی سـاڵی ١٣١٧ ی تەممـوز لـە داهاتـی دوورخـراوان ٣٥ پـارە کـەم بۆتـەوە، بـرە پـارەی باسـکراو بـە ئامادەکردنـی سـەنەدی خاوەنەکـەی مانگانـە لەگـەڵ خشـتـەی مانگانـەدا تۆمـار بکرێـت، لـە نـووسراوی بەرێوەبەرایەتـی مەعاریفـی موسـڵ نووسراوەتـەوە، ئەمـەش دەنێردرێتـە قەڵـەم.



DH.MKT.00766.00053.001

| DH.MKT | 00766.00053 | 21 شەوال 1320 |
| --- | --- | --- |

شورای دەوڵەت
دادگای پێداچوونەوە
ژمارە ١٦٠
بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە
فەتـاح ئەفەنـدی کاتیبـی باجـی پێشـوو قـەزای رانیـە سـەر بـە سـانجەقی کەرکووکـی نـاو ویلایەتـی موسـڵ ئەرکـی تۆمارکردنـی باجـی پـێ سـپێردراوە پروپاگەنـدە کـراوە کـە بـە بـێ پـول دابەشـی کـردووە و لـە کۆکردنـەوەی داهاتیـش زۆرەملـی و توندوتیـژی بـەکار هێنـاوە، هەروەهـا لـە سـەردەمی ئەرکەکەیـدا گۆڕانـکاری لـە راسـتکردنەوەی نەکـردووە، لەبـەر ئـەوەی جێـگای گومانـە، رێگـە نـەدراوە دادگایـی بکرێـت بـە بڕیارنامـەی دادوەری لێکۆڵینـەوە پەسـەند کـراوە، ئـەو بڕیارنامەیـەی لـە دەسـتەی تۆمەتبارکردنـی ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت دراوە، لـە بـارەی ناوبـراو لەلایـەن ژمێریـاری لیـوای ناوهاتـوو داواکاری پێداچوونـەوە دراوە، لـە وەڵامـدا لـە دادگای پێداچوونـەوەی شـورای دەوڵـەت بەڵگەنامـەی فەرمـی ڕێکخـراوە و هاوپێـچ پێشکەشـی جەنابـی سـەدری ئەعـزەم کـراوە، چۆنیەتـی و خەرجـی بەڵگەنامـە فەرمیەکـە کـە ٢٠٠ قوروشـە دابینکـراوە و لـە سـەرۆکایەتی دادگای ناوهاتـوو نێـردراوە، لـە بـارەی ئـاگادار کردنـەوەی ویلایەتـی ناوهاتـوو بـۆ نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار فەرمـان و حەواڵـە نێـردراوە لەگـەڵ نەزارەتـی دارایـی و سـەرۆکایەتی شـکۆداری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە زانیـاری دەنێردرێـت، لـەم بابەتـە بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
سەرۆکی شورای دەوڵەت



| 18 رەبیعی یەکەم 1320 | 001873.140465 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
وەڵامـی نـووسراوی ٢٩ موحـەررەم ١٣٢٠ ژمـارە ٢١٣ ی عالـی سەرعەسـکەرە، بـۆ چاکسـازی لـە بارودۆخـی ئێسـتای سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی هێـزی سـەربازی رێکخـراوە، بـۆ پێداویسـتی سـەفەر و خەرجـی گەشتەکەشـی ئاقچـە رێکخـراوە و سـەرەتا بـە دەفتـەرداری موسـڵ راگەیەنـدراوە، بـۆ کارگێـری کردنـی هێـزی ناوبـراو ئـەم بـرە پارەیـەی کـە لـە قوماندانیـەت داوا کـراوە بـە گرنگیـەوە جێبەجـێ بکرێـت، بـۆ بـێ دەنـگ کردنـی سـەربازانیش نـووسراو بـۆ دەفتـەرداری ناوبـراو کـراوە، بـە پەیوەنـدی کـردن نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار وەڵامـی داوەتـەوە.



| 12 سەفەر 1320 | 001852.138841 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەرعەسکەر
بـۆ چاککردنـی بارودۆخـی سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی، بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیدارانـی خەلافـەت هێـزی سـەربازی رێکخـراوە، بـۆ دابیـن کردنـی پێداویسـتی گەشـتکردن و خەرجیەکانیـان، بـڕە پـارەی دیاریکـراو لـە مەرکـەز وەردەگیرێـت، تەلەگرافنامـەی ڕەزامەنـدی لـە فەرمانگـەی خـۆی رێکخـراوە، بـە دەفتـەرداری ویلایەتـی موسـڵ راگەیەنـدراوە، لەسـەر دوو پارچـە نـووسراوی عالـی سـەر عەسـکەر لـە مێـژووی ١٩ و ٢٤ زیلحیجـە ١٣١٩ ژمـارە ٢١٥ و ١٥٣ هەروەهـا لـە وەڵامـی ئـەو ئامـاژەی کـە پێشـوو نێـردراوە، ئەمجـارە لـە نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار نـووسراو دەکرێـت.




BEO.001867.140000.002

<table>
<tr><td>5 ڕەبیعی یەکەم 1320</td><td>001867.140000</td><td>BEO</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە<br>٦٩٣<br>مەجید ئەفەندی لە سەیدەکانی سلێمانی لە هەولێر نیشتەجێیە و بە وەرگرتنی زانست خەریکە، بۆ داواکردنی مووچە نووسراو پێشکەشی ویلایەتی وان کراوە، لە مێژووی ٢ ئۆغستۆس ١٣١٧ ژمارە ١٨٣١ بە فەرمانی پاشا باس کراوە، ناوبراو لە خەزینە و لە سانجەقی کەرکووک مانگانە ١٨٠ قوروش مووچەکەیەتی، هەروەها نووسراوەتەوە، مووچەی ناوبراو لە مووچەی دەستکورتان ١٠٠ قوروش زیاد دەکرێت و دەبێتە ٢٨٠ قوروش، ئەم بریارەش نێردراوەتە ژمێریاری گشتی و قسەی لەسەر کراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری دارایی</td></tr>
</table>



BEO.001873.140465.002

| BEO | 001873.140465 | 16 رەبیعی یەکەم 1320 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
قەڵەمی تۆمارکردن
ژمارە ٨٢٥
بـۆ چاکسـازی کـردن لـە بارودۆخـی ئێسـتای سـانجەقی کەرکـووك و سـلێمانی هێـزی سـەربازی ڕێکخـراوە، بـۆ ڕێکخسـتنی ئیـدارەی ئـەم هێـزە سـەربازییە لەلایـەن جەنابـی قومانـدان موحسـین پاشا ئامـاژەی بـە بـری پـارەی ڕێکخسـتنی ئیدارەکـە کـردووە، لەگـەڵ نـووسراوی لایەنـی واڵای سەرعەسـکەر پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە و ئامـاژەی پێشـوو ئـەوا لـە نـووسراوی سـەدری ئەعزەمـی پەیوەندیـداری سـەدارەت لـە مێـژووی ٥ مایـس ١٣١٨ ژمـارە ٩٦٨ فەرمـان و نـووسراوی پـێ دەرکـراوە کـە جێبەجـێ بکرێـت و ڕابگەیەندرێـت، سـەرەتا لەسـەر فەرمانـی عالـی بـۆ خەرجـی گەشـتەکە و ڕۆیشـتنی هێـزی سـەربازی ناوهاتـوو ئاقچـەی پێویسـت لـە مێـژووی ٦ مایـس هەمـان سـاڵ بـە تەلەگـراف بـە دەفتەرداریەتـی موسـڵ ڕاگەیەنـدراوە، بـۆ ڕێکخسـتنی ئـەو ئیدارەیـە لـە قوماندانیەتـی ئـەو برەیـەی کـە داواکـراوە بـە گرنگیـەوە جێبەجـێ بکرێـت، بـۆ هێـور کردنـەوەی ئیـدارەی سـەربازی ئەمجـارە بـە تەلەگـراف دەفتـەرداری ناوهاتـوو ئـاگادار کراوەتـەوە، بـە ووتـەی ژمێریـاری گشـتی دارایـی ڕاگەیەنـدراوە و نـووسراوی نێـردراوی سەرعەسـکەر هاوپێـچ پێشکەشـی پێشـەوا سـەدری ئەعزەمـی پایەبـەرز کـراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمانـی بەدەسـتەوەیە.
نازری دارایی




BEO.001883.141201.001

| BEO | 001883.141201 | 6 رەبیعی کۆتایی 1320 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە موتەسەرفی بە وەکالەتی کەرکووك ئیلیاس سامی ئەفەندی لە موتەسەرفیەتی سانجەقی سلێمانی دامەزرێت، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی دەوڵەت لە مێژووی ١٦ رەبیعی یەکەم ١٣٢٠ ژمارە ١٩٢٠ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە دوای رەزامەندی لە مێژووی ٢ رەبیعی کۆتایی ١٣٢٠ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت رەزامەندی نیشان داوە، وێنەی بریارنامەی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 1320 زيلحيجه 18 | 002022.151583 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەرعەسکەر
سـەیدەکانی جەبـاری سـانجەقی سـلێمانی لەگـەڵ تاڵەبانیەکانـی کەرکـووك ناکۆکـی و رووبەرووبوونـەوە کەوتۆتـە نێوانیانـەوە، لـەم شـەڕەی لـە نێوانیـان روویـداوە، لەلایـەن تاڵەبانیەکانـەوە دوو پیـاوی بـە دەسـەڵاتی جەبارییەکانیـان کـوژراوە، ئـەم ئـاژاوەی لـە نێوانیانـدا هەیـە، زیاتـر پـەرەی سـەندووە و خەریکـی کۆکردنـەوەی کۆمەڵـەن، هەروەهـا هـەردوولا خۆیـان ئامـادە دەکـەن هێـرش بکەنـە سـەر یەکـتر، لەسـەر ئـەم راگەیەنـدراوە ئـەوەی پێویسـت دەکات ئـاگاداری بدرێتـە لایەنـەکان، لـە ویلایەتـی موسـڵ ئامـاژەی پێکـراوە و لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆداریش نـووسراوی ١٧ زیلحیجـە ١٣٢٠ ژمـارە ٤٤ هاوپێـچ بـۆ سـەروو نێـردراوە، لەلایەنـی سەربازیشـەوە بەپەلـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و چۆنیەتـی ئەنجامدامـی کارەکـە و هاوپێچەکـەی بنێردرێتـەوە.


DH.TMIK.S.00049.00050.001

| 26 رەجەب 1321 | 00049.00050 | DH.TMIK.S |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٣٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی ئەفەندم
ئەمجارە لە موتەسەرفی کەرکووك بوودجەی شارەوانی قەزای کۆی سانجەق نێردراوە، هاوپێچ پێشکەشی جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت کراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نوری والی موسڵ




DH.TMIK.M.00160.00011.002

| DH.TMIK.M | 00160.00011 | 13 شەوال 1321 |
|---|---|---|

نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف

قەڵەمی تۆمارکردن

وێنەی تەلەگرافنامە لە باش مودیرەتی بەغداد بۆ نەزارەت نێردراوە

لـە خۆچێـی هـەواڵ دراوە کـە هێڵەکانـی تەلەگرافـی سـانجەقی سـلێمانی لەلایـەن دانیشـتوانی گوندەکانـەوە بەبـێ مـاوە بـە سـێ و پێنـج و دە مەتـر لێدەکرێتـەوە و دەبردرێـت، بۆیـە چەندیـن جـار سـەردانی موتەسـەرفیەتی ویلایەتەکانـی کەرکـووك و سـلێمانی کـراوە، تەنانـەت ئـەو کاتـەی کـە لـە کەرکـووك بـووم، لـە هێڵەکـە دەپچرێنـن و دەیبەنـە گوندێـك ٣ کاتژمێـر لـە کەرکـووك دوورە، لەسـەر بینایـەکان دایدەنێـن، هـەواڵ هاتـووە لـە بـارەی بوێـری کەرانـەوە هیـچ مامەڵەیەکـی یاسـایی ئەنجـام نـەدراوە، لەگـەڵ ئەمـەش وەڵامیـش وەرنەگیـراوە، هەروەهـا لـە نێـوان چەمچەمـاڵ و سـلێمانیدا ئەمجـارە ١٢ مەتـر دزراوە و لـە فەرمانبەرانـی چەمچەمـاڵ راگەیەنـدراوە کـە هەواڵـی لیـوای ناوهاتـوو پچـراوە، لـە بابـی عالـی لایەنـی سـەدری ئەعزەمـەوە بـۆ ویلایەتـی موسـڵ و لـە پایـەی سەرعەسـکەرەوە بـۆ موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی همایـۆن فەرمانـی کاریگـەر و یەکلاییکـەرەوە بدرێـت، ئەمـەش بۆچوونـی پەیوەندیدارانـی نەزارەتـە، فەرمـان.



DH.TMIK.M.00162.00014.001

| DH.TMIK.M | 00162.00014 | 8 زیلقەعدە 1321 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
٣٥٢٨
راگەیەندراوی بەندەیە
چاککردنی پەیوەندی نێوان هۆزەکانی کۆی سانجەق و شێخ بزێنی ئەنجام دراوە، بۆ ئەم کارە تابوری دووەمی ئاڵای ٤٥، لە قەڵای ساتۆ بوونی هەیە، لە موتەسەرفی کەرکووک داواکراوە بۆ ئەوەی هەژمارکردنی ئاژەڵی دانیشتووانی رانیە جێبەجێ بکات، بۆ ئەم مەبەستە لە وەکالەتی قوماندانیەتی فرقەی ١٢ تەلەگرافنامە هاتووە، رەزامەندی دراوە، هەروەها بە تیروانین لە فەرمانی هەژمارکردنی ئاژەڵەکانی دانیشتووان، هەموو کات یاریدەدەری سەربازی داوا دەکرێت، بۆ ئەمەش فەرمان دراوە بە ناردنی هێزی ناوهاتوو بۆ رانیە، لە تەلەگرافنامەی موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە، تێدا ئاماژەی پێکراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
رزا سەرعەسکەر




DH.ŞFR.00308.00040.001




DH.ŞFR.00308.00040.001

| DH.ŞFR | 00308.00040 | 24 رەبیعی یەکەم 1321 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لە تەلەگرافنامەکانی ٢٥ مایس ١٣١٩ راگەیەندراوە، لە دەڤەری قەزای زێبار کە سەر بە سانجەقی کەرکووکە، ناحیەکانی شێروان و مزوری باڵاش کە سەر بە قەزای رواندزن، هەژماری سەرمەڕ هەژمار نەکراوە، بۆیە باجەکەشی کۆنەکراوەتەوە و نەهاتۆتە دەست، تەنیا لەبەر دەست درێژی پیاوەکانی شێخ سدیقیش کەس داوای دە یەکیشی نەکردووە، بەڕێوەبردنی کارگێری بەرێکوپێکی بەرێوە ناچێت، بۆیە لە موتەسەرفی کەرکووك ئاماژە بە جێبەجێ کردنی کارەکە کراوە، لەبەر دەستدرێژی ئەو دواییە ناحیەکان بە قەزاکانی عەقرە و عەمادیە بەستراوەتەوە، بە هەمان شێوە رووداوەکان بەردەوامن، بۆیە لە مێژووی ٩ کانوونی دووەم ١٣١٨ ژمارە ٢٥٢ بریارنامە راگەیەندراوە، دووبارە قەزای زێبار رێك دەخرێتەوە، کاتی خۆی لەبەر نەبوونی هەوڵ و کۆشش تا ئاسایشی بەرقەرار بکرێت هەڵوەشاوەتەوە، داهاتی خەزینەی دوو ساڵی بە تەواوەتی بە هەدەر چووە، ئەم هەڵوەشاندنەوەیە خزمەتی دەستدرێژی و زوڵمی شێخی ناوبراوی کردووە، خەرجی ناردنی سەرباز لەگەڵ داهاتەکان یەکسانە، بۆیە دووبارە قەزای ناوبراو لە رووی کارگێڕیەوە رێك بخرێتەوە، دووبارە راگەیەندراوە، فەرمان.
نوری والی موسڵ



ML.EEM.00459.00021.001

| ML.EEM | 00459.00021 | 3 شەوال 1321 |
|---|---|---|
| خشتەی ئاماری سووتا و رووخانی ئەم بینایانەی کە دروست کراوە و نۆژەنکراوەتەوە | | |

رووخـــاوەکـان

| دەبێتە | خانە | خان | دوکان | ئاش | گشتی | شوێن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢١٦ | ٢٠٩ | ١ | ٣ | ١ | ٢ | سانجەقی کەرکووک |
| ٧ | ٣ | | ٤ | | | سانجەقی سلێمانی |



| 19 زیلقەعدە 1321 | 00818.00031 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ سەرۆکایەتی دیوانی ژمێریاری عالی<br>مەرکـەزی سـانجەق و سـانجەقی کەرکـووك دەفتـەری ئیکرامیـەی حەرەمینـی شـەریفەین بـە نـووسراوی ١ تشرینـی دووەم ١٣١٩ ژمـارە ٢٥٦ بـۆ سـەرۆکایەتی عالـی نێـردراوە، لـە تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی موسـڵ روون بۆتـەوە، دەفتـەری ناوبـراو بـە فەرمـان رەوانـی نەزارەتـی عاجیزانـەم دەکرێـت، بـە ووتـەی ژمێریـاری نـووسراوی بـۆ کـرا. | | |




DH.MKT.00830.00032.001

| DH.MKT | 00830.00032 | 27 زيلحيجة 1321 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار

لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووک بـۆ بەرێوەبەرایەتـی دیزەلـی محەمـەد سـاڵح ئەفەنـدی دامـەزراوە، بـۆ خەرجـی ڕێـگا ١٤٧٩ قـوروش لـە نەزارەتـی عاجیزانـە لـە دابینکراوەکانـی ئـەم سـاڵە دابیـن کـراوە، بـە هەژمـار کردنـی بـە پێویسـت زانـراوە ڕەوان بکرێـت، بـۆ ئەمـەش نـووسراو کـرا.

| BEO | 002170.162707 | 25 جەمادی کۆتایی 1321 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والای سەر عەسکەر
بۆ کۆکردنەوەی رسومی نوێی ئاژەڵی دانیشتوان بە فەرمانی لەشکری همایۆن هەر ئێستا هێزی تەواو بۆ سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووك بروات، بۆ ئەمەش تەلەگرافنامەی مێژووی ٣ ئەیلوول ١٣١٩ی ویلایەتی موسڵ بە گرنگیەوە راگەیەندراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە بەپەلە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت و هاوپێچ رەوان بکرێتەوە.



| 2 شەعبان 1322 | 00053.00022 | DH.TMIK.S |
|---|---|---|

بۆ پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
لەگـەڵ ویلایەتەکانـی ئـەرزروم و موسـڵ مەرکـەزی سـانجەقی کەرکـووك و قەزایەکانـی هەولێـر و سـەڵاحیە و عەقـرە فەرمانگـە شـارەوانیەکانیان بوودجـەی سـاڵی ١٣٢٠ نێـردراوە، ئـەم نووسراوانـەی کـە وەرگیـراوە، لـە شـورای دەوڵـەت ووردبینـی بـۆ بکرێـت، بـە هاوپێچـەوە پێشـکەش کـرا.


DH.ŞFR.00325.00142.001

| DH.ŞFR | 00325.00142 | 30 موحەڕەم 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ناو کەرکووك حوسێن مستەفا ئەفەندی قائیمقامی رانیە دەستی لە کار کێشاوەتەوە و ئەرکەکەی بەجێ هێشتووە، دەست لە کار کێشانەوەکەی هێنراوە و پێشکەش کراوە، قەزای ناوهاتوو کۆمەڵگای هۆزەکانە، ئەو قائیمقامانەی لە دەرەوە دێن ناتوانن کاروباری ناوچەکە بە رێکوپێکی بەرێوەببەن، ناوە ناوە بە وەکالەت ئەرکەکە بەرێوەدەبردرێت، بەمەش کێشەکان زیاتر دەبن، لە بەر هۆکاری مێژووی ٣ نیسان ١٣٢٠ ژمارە ٢٠ سەعید بەگی رواندز لە زاڵمەکانی قەزای رواندز رزگار بکرێت و لە قائیمقامیەتی رانیە دابمەزرێت، تکا کراوە فەرمان.
نوری والی



DH.ŞFR.00328.00121.001

| 15 ڕەبیعی یەکەم 1322 | 00328.00121 | DH.ŞFR |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
گوایە بۆ داواکردنی دووبارە ڕێکخستنەوە کارگێری مۆڵگەی زێبار دانیشتووانی ناحیەی شێروان چوونەتە زێبار، خەڵکی مزوریش لاسایی و چاودێری ئەوانیان کردووە، ئەگەرچی ئەمە لە رواندز راگەیەندراوە، ئەمرۆ لەلایەنی سەربازیەوە نووسراوی بیمباشی رەدیفی زێبار رۆیشتووە، بە گوێرەی ئەو نووسراوانە هۆکاری نەرۆیشتنی شێروانیەکان بۆ زێبار دەگەڕێتەوە بۆ سنوور بەزاندن و پەلامارەکانی جانەوەرەکانی شێخ سدیق، موتەسەرفیەتی کەرکوك و قائیمقامیەتی عەقرە داواکاری پێویست راگەیەندراوە، بۆ راگرتنی دەستدرێژیەکانی شێخی ناوبراو راگەیەندراوی پێویست بە ویلایەتی وان راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێکردنی فەرمان.
والی موسڵ نوری



| 6 موحەررەم 1322 | 00341.00077 | DH.ŞFR |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ٧ مارت ١٣٢١، بۆ رێگری کردن لە ناکۆکی و رووداوەکانی بارزانیەکان و شێروانیەکان لەگەڵ شێخ سدیق، موتەسەرفی کەرکووك و قائیمقامی عەقرە ئاگادار کراوەتەوە، جموجۆڵی شێخ سدیق و گەندەڵیەکانی یەك لە دوای یەکە، لە راگەیەندراوی یەکەم و دووەم فەرمانی دووبارە رێکخستنەوەی مۆڵگەی قەزای زێبار پێشکەش کراوە، لەم دەورووبەرەش ناتوانرێت پۆلیس دابنرێت، راگەیەندراوە، فەرمان.
والی موسڵ نوری



MF.MKT.00835.00001.001

| MF.MKT | 00835.00001 | 2 زیلحیجە 1322 |
|---|---|---|

له مێژووی ٢٦ کانوونی دووەم ٣٢٠ نێردراوەتە ژمێریاری
مووچەی چوار مانگی لێوای موسڵ لە تشرینی دووەمەوە، هەروەها لیوای کەرکووك لە ئۆغستۆسەوە مووچەی حەوت مانگ لە یەکەی سندوقی بانقی زراعەت وەردەگیرێت، جگە لەمە ئەوانەی ماوەتەوەش لەگەڵ لیوای سلێمانی بە تەواوەتی لە سندوقی دارایی دەدرێت، پێشەکی کارەکە لە نەزارەتی شکۆدار بۆ نەزارەتەکانی دارایی و بازرگانی و نافیعە نێردراوە، بە پێویست زانراوە ڕێکخستنی بۆ بکرێت، بە گوێرەی وەڵام کە بە تەلەگراف چۆنیەتی جێبەجێ کردنی مامەڵەکە و چاودێری کردنی بنوسرێتەوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی بۆ ئەوە کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.




DH.MKT.00847.00043.001

| DH.MKT | 00847.00043 | 25 موحەررەم 1322 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
ژمارە ١٨
جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە
لە ناو ویلایەتی موسڵ قەزای سەڵاحیەی سەر بە سانجەقی کەرکووك سەبارەت بە بێتاوانی فەرمانبەری پێشووی توزخورماتو و مەملەحە عوسمان سەلیم ئەفەندی لەگەڵ قەنتارچی ئیبراهیم ئاغا، لە ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو دوای ووردبینی کردنی پێداچوونەوەی حوکمەکە پەسەند دەکرێت، بۆ ئەمەش نووسراوی بە زانیاری لە دادگای پێداچوونەوەی شورای دەوڵەت رێکخراوە و هاوپێچ پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت جەنابی پاشا کراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە جێبەجێ کردنی بابەتەکە و خەرجی ئیعلامەکە دەکاتە ١٠٠ قوروش لە بەڕێوەبەرایەتی کارگێری گشتی دیوان بۆ شورای دەوڵەت نێردراوە بۆ ئەمەش حەواڵەی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار کراوە تا ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو وەربگیرێت، هەروەها بۆ ئەوەی زانیاری بدرێتە بەڕێوەبەرایەتی کارگێری داهاتی دابینکراو و داواکاری کەسێتی قەرزی گشتی عوسمانی لە نەزارەتی دارایی شکۆدار بریار و فەرمان دەردەچێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
سەرۆکی شورای دەوڵەت



| 27 زیلحیجە 1322 | 00935.00061 | DH.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقی خانەنشینی مولکیەی عالی
بەڕێوەبـەری تەحریراتـی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك سـاڵح حالـەت ئەفەنـدی داوای مووچـەی دوورخراوانـی کـردووە، نـووسراوی کەسـێتی پەسـەندکراو خشـتەی مـاوەی خزمەتـی ڕێکخـراوە، هاوپێـچ بـۆ سـەروو نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.



تلغرافنامه
Y.PRK.DH 13/52

Y.PRK.DH.00013.00052.001

| Y.PRK.DH | 00013.00052 | 23 جەمادی کۆتایی 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لــە ١١ ئۆغســتۆس ١٣٢١ هاوپێچــی تەلەگرافنامــەی بەندەمانــە، لــە ســانجەقی کەرکــووك ئەوانــەی هەڵاتــوون و رایــان کــردووە نەدۆزراونەتــەوە لەســەر راگەیەنــدراوی موتەســەرفی ناوچەکــە راگەیەنــدراوە.
نوری والی موسڵ



MF.MKT.00858.00075.003

| MF.MKT | 00858.00075 | 8 جەمادی کۆتایی 1323 |
|---|---|---|

ژمارە ٤٣
بۆ نەزارەتی مەعاریفی شکۆداری لایەنی پاشا
راگەیەندراوی بەندەیە
لە زاناکانی کوردستان شێخ محەمەد ئەفەندی داواکاری پێشکەشی نەزارەتی شکۆدار کردووە ، لەبەر نەبوونی و خراپی بژێوی ژیانیەوە کە لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەش ئەنجام دراوە و دەرکەوتووە، لێرە لە شوێنێکی گونجاو ئەرکی موعەلیمی پێ بدرێت و دابمەزرێت، بەم راگەیەندراوە فەرماننامەی ژمارە ١٢ لە ١٦ مایس ١٣٢١ جەنابی خدێوی بریار و فەرمانی داوە، لە کاتی حەواڵە کردنی بۆ ئەنجوومەنی مەعاریف شێخی ناوبراو لە سانجەقی کەرکووك لە مەکتەبی روشدیەی سەڵاحیە وەکو یاریدەدەری موعەلیم هەڵبژێردرێت و رابگەیەندرێت، دوای ئەوەی لە دەستوور بریار بدرێت، ئەم کاتە فەرمانی پەسەند کردنی ئەرکەکەی جێبەجێ دەکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
بەڕێوەبەری مەعاریفی موسڵ و بەڕێوەبەری مەکتەبی دواناوەندی




ŞD.01222.00069.001

<table>
<tr><td>ŞD</td><td>01222.00069</td><td>6 زیلقەعدە 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی بازرگانی و نافیعە<br>بانقی زراعەت<br>٤٨٠٠٠ گشتی<br>٢٤١ تایبەتی<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>داهاتی ئەم باغانەی کە پەیوەستن بە ئاوقافی جەنابی پەیوەندیداری رسالەتی شکۆدار بۆ بەشی مەعاریف و ئەوانی تر لە رێکخستنی پێداویستی سەربازی، بە نووسراوی سەدری ئەعزەم لە پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ٤ تشرینی دووەم ١٣٢٠ ئاگاداری لە نەزارەتی دارایی شکۆدار بۆ دەفتەرداری ویلایەتی موسڵ نێردراوە، بۆ ئەم مەبەستە لە سانجەقی کەرکووك گوندەکانی تسعین و تەپەلو سەر بە مەرکەزی قەزا و بەستراو بە ئاوقافی شکۆداری ناوهاتوو لەم ساڵەدا خراوەتە موزایەدە و ئەم دە یەکەی کە لێی دەرهاتووە، دەرکەوتووە بەشی مەنافیع و مەعاریف وەرنەگیراوە، بۆیە لە کارگێری بانقی زراعەت ئاماژەی پێکراوە ئاخۆ رێگە دەدرێت بەشی مەنافیع و مەعاریف لە دە یەکی ئاوقافی شکۆداری ناوهاتوو وەردەگیرێت یاخود وەرناگیرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری بازرگانی و نافیعەت</td></tr>
</table>



| 10 ڕەبیعی کۆتایی 1323 | 002599.194900 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>لـە ژمێریـاری سـانجەقی کەرکـووك شـوکری ئەفەنـدی ژمێریـاری سـانجەقی ئیـك دادەمەزرێـت، لـەم بارەیـەوە نـووسراوی ٧ نیسـان ١٣٢١ ژمـارە ٤٠٨ و بـە بڕیـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە لـە مێـژووی ٩ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٢٣ فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت ڕەزامەنـدی دراوە، هیممـەت بکرێـت لە جێبەجـێ کردنی. | | |

BEO.002650.198725.001

| BEO | 002650.198725 | 20 جەمادی كۆتایی 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار
موتەسەرفی سانجەقی كەركووك بە كراوەیی ماوەتەوە، لە بارەی گواستنەوەی موتەسەرفی سلێمانی سالم پاشا لەسەر نووسراوی مێژووی ٧ تەمموز ١٣٢١ ژمارە ١٩٨٠ ی دەوڵەت بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولكیە، پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ١٩ جەمادی كۆتایی ١٣٢٣ رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی.




DH.MKT.01089.00013.002

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01089.00013</td><td>6 رەبیعی کۆتایی 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">پایەی سەر عەسکەر<br>قەڵەمی تۆمار<br>٧٦<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەگەڵ بەرزکردنەوەی داوای شێخەکانی سلێمانی بە ناوی شێخ مەحمود ئەفەندی، روون بۆتەوە منداڵ و پارەوپول و ئەملاکی بە چ ڕێگایەك دووچاری سەرپێچی بۆتەوە، هەندێك ووتە و داواکاری بە مۆری نووسراوی بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك حەسەن بۆ پایەی بەندەمان نێردراوە، داواکاریەکە هەروەکو خۆی بە هاوپێچەوە بۆ پەیوەندیدارانی نەزارەت نێردراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>




| 29 جەمادی کۆتایی 1324 | 01110.00066 | **DH.MKT** |
|---|---|---|
| نەزارەتی دارایی عالیە<br>مستەفا رەفعەت ئەفەندی لە بەرێوەبەری ناحیەی قەرەتەپەی سەر بە سانجەقی کەرکووك دامەزراوە، خەرجی رێگای کە دەکاتە ١٤٧٩ قوروش لە نەزارەتی عاجیزانەم لە دەرماڵەی ئەم ساڵدا هەژمار بکرێت و بە ووتەی ژمێریاری نووسراو کراوە. | | |



| 24 موحەررەم 1324 | 002788.209076 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار<br>بـە مەبەسـتی برینـەوەی بـری ٣٠٠ قـوروش مووچـەی دوورخـراوان بـۆ بەرێوەبـەری پێشـووی سـانجەقی كەركـووك سـاڵح حالـەت ئەفەنـدی بـە بریـاری شـورای دەوڵـەت لـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان داوە، بـە ئـاگادار كردنـەوەی نـەزارەت هیممـەت بكرێـت لـە جێبەجـێ كردنـی كارەكـە. | | |



| 25 رەبیعی کۆتایی 1324 | 002852.213868 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>ئـەم مەزبەتـەی کـە لـە فەرمانگـەی مولکیــەی شــورای دەوڵـەت نێردراوەتـە قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانــی مولکیــە وێنەکـەی لــە بـاڵا خوێندنـەوەی بــۆ کــراوە، لــە نەزارەتــی ناوەخــۆی شــکۆدار داوا کــراوە هیممــەت بکرێــت لــە جێبەجــێ کردنــی.<br><br>سەبارەت بە بەکارهێنانی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك مەحمود بەگ. | | |



DH.TMIK.M.00240.00010.002

| 16 سەفەر 1325 | 00240.00010 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
لـە سـانجەقی کەرکـووك سـەرۆکی عەشـیرەتی ئەلعەبیـد بـە نـاوی عەبدولعەزیـز و هاوەڵانـی لەسـەر رووبـاری دیجلـە لـە شـوێنێك بـە نـاوی فەتحـە نیشـتەجێ بـووە و ئـەم کەلوپەلـە بازرگانیـەی کـە بـەوێ تێدەپەرێـت، رێگەیـان لـێ دەگرێـت و بـە نـاوی خـاوە رسـوماتیان لـێ وەردەگرێـت، ئـەوەی نەیـدات رێگـە نـادات تێپەرێـت، بۆیـە پێویسـتە ناوبـراو لـەم شـوێنە دەربکرێـت و رێگـە نەدرێـت ئـەم کارە ئەنجـام بـدات، ئـەم نـوسراوەی کـە لـە ویلایەتـی بەغـداد وەرگیـراوە، وێنەیەکـی لەگـەڵ ووتـەی قۆمیسـیۆنی مامەڵـەی بـە پەلـە هاوپێـچ نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 17 ڕەبیعی کۆتایی 1325 | 00245.00010 | DH.TMIK.M |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
٥٠ ساڵ دەبێت لە سانجەقی سلێمانی بە تاپۆ زەوی و مولك لە ژێر دەستیەتی، بۆ ڕێگەگرتن لە سەرپێچیەکانی، لەلایەن بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك حەسەن ئەفەندی داواکاری پێشکەشی پایەی سەدارەت کراوە، بە وتەی قۆمیسیۆن پەلە لە مامەڵەکە بکرێت، بە تێروانین لە بابەتەکە هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 21 جەمادی یەکەم 1325 | 01062.00066 | ŞD |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکانی خانەنشین و دورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٧٠٩٩
فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکـووك خەلیـل ئەفەنـدی مـردووە، لەلایـەن خێزانەکـەی حافیـزە دووەمـی خانـم داواکاری دابیـن کردنـی مووچەیەکـی کـردووە، لـە ویلایەتـی ترابـزۆن نـووسراو و داواکاریەکـە لەگـەڵ خشـتەی مـاوەی خزمەتـی ئەوراقـی تایبـەت بـەم بابەتـە لـە ژمێریـاری رێکخـراوە لەگـەڵ پۆسـتەی دەرکەنـار لـە دەسـتەی گشـتی ووردبینـی بـۆ کـرا. بە پشت بەستن بە پۆستەی ناوهاتوودا خزمەتی پێشووی ناوبراو لەگەڵ بری ئەم مووچەیەی کە وەریگرتووە و بریارنامەی فەرمانبەرانی خانەنشینی مولکیە ناوبراو دەردەکەوێت ١٣١ قوروش مووچەی هەبووە، لە بارەی بێ خاوەن بوونی مووچەی ناوهاتوو بە پشت بەستن بە بریارنامەی یاسا مامەڵەکەی جێبەجێ دەکرێت، لە سندوق دابین کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.



| 7 جەمادی یەکەم 1325 | 01143.00049 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
دووبـاره ئەوراقـی زانیـاری کەسـێتی فەرمانبـەری ناسـنامەی کەرکـووك سـاڵح ئەفەنـدی هاتـووه و سـاڵی ١٣١٤ نووسراوەتـەوه، بـەڵام ئەوراقـی جێگیرکـراو بـۆ ئـەم لایـه نەهاتـووه، بـۆ ئـەوەی مـاوەی خزمـەت و بـری مووچەکـەی و پاکانـە و ئامـاژەی تۆمـاری زانیـاری و ئەوراقـی ناوهاتـوو یەکلایـی بکرێتـەوه و ڕەوان بکرێـت، لـە هۆبـەی تۆمـاری کەسـێتی نـووسراوی بـۆ کـراوه.



| 1325 زیلحیجه 18 | 01166.00048 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
نوری ئەفەندی کە بەڕێوەبەری رسوماتی قەلعەی سوڵتانیە بووە کۆچی دوایی کردووە، خێزانەکەی بژێوی ژیانیان باش نەبووە، بە مەبەستی گەرانەوەیان بۆ مەملەکەتی خۆیان کە کەرکووکە، خەرجی ریگایان بۆ دابین بکرێت، بۆ ئەمەش پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی دراوە و وێنەی مابەینی هومایۆنی جەنابی ملوکانەی باش کیتابەتی شکۆدار بۆ موتەسەرفی بیغا نێردراوە، لەگەڵ 31 کانوونی دووەم 1320 تەلەگرافنامە دەرچووە و روون کراوەتەوە، 10 هەزار قوروش لە دارایی ناوەخۆ رێکخراوە، لە خەزینەی شکۆدار لە مێژووی 29 ئۆغستۆس 1321 ی نەزارەتی عاجیزانە لە داهاتی ساڵی 1320 هەژمار کراوە و ساڵانە خولاوەتەوە و نێردراوە، بەڵام بڕە پارەی ناوهاتوو ماوەی لێکۆڵینەوەی بەسەر چووە و بە بریاری لێکۆڵینەوەش پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم خەرجیانە بکرێت کە پەیوەستە بە داهاتی ساڵانی رابردوو، بە پەیوەندی کردن هەژمارکردنی داهاتی ئەم ساڵە بە ئاماژەی نەزارەتی شکۆدار باس کراوە، بڕە پارەی ناوهاتووش لە داهاتی ئەم ساڵەدا دابین دەکرێت.




DH.MKT.01173.00021.001

| DH.MKT | 01173.00021 | 29 ڕەبیعی کۆتایی 1325 |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی

لـە سـانجەقی کەرکـووك فەرمانبـەری ناسـنامە سـاڵح ئەفەنـدی دووبـارە نـووسراوی وەرگێـردراوی زانیـاری هاتـووە، ناوبـراو لـە سـاڵی ١٣١٤ بـۆ دووەم جـار لـە ئەرکـی حەواڵەکردنـی دە یەکـی قـەزای هەولێـر ئەرکـی پێـدراوە، ئەگـەر نووسراویـش کـراوە، بـەڵام نـووسراوی پەسـەندکراوی پەسـەند نەکـراوە، مـاوەی بەکارهێنانـی لەگـەڵ بـری مووچەکـەی و چۆنیەتـی پاکانەکـەی زانیـاری تۆمـاری پێویسـتە ڕەوان بکرێـت.



| 9 جەمادی کۆتایی 1325 | 01186.00034 | DH.MKT |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
٨٣
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
لە ناو ویلایەتی موسڵ ناحیەی توزخورماتو کە سەر بە سانجەقی کەرکوکە، پێویست ناکات فەرمانبەری قەرزی گشتی ناحیەی ناوهاتوو خورشید ئەفەندی دادگایی بکرێت، لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەتی ناوهاتوو حوکمەکەی پاك دەرچووە و ووردبینیەکەشی لەلایەن داواکاری کەسێتی خۆچێی نەزارەتی بریکاری داواکاری نووسراوی تەمیز دەرچووە و بۆ وەڵامدانەوە لە دادگای پێداچوونەوەی شورای دەوڵەت، ئیعلام ڕێکخراوە و بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت نێردراوە، خەرجی ئیعلامەکە ١٠٠ قوروشە، لە کارگێری داواکاری پێداچوونەوەی قەرزی گشتی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و بۆ شورای دەوڵەت نێردراوە، سەبارەت بە ئامـاژەی ویلایەتی ناوهاتوو زانیاری دراوەتە ناوەخۆ و کارگێری داهاتی دابینکراوی داواکاری کەسێتی قەرزی گشتی، فەرمان و حەواڵە دراوەتە نەزارەتی دارایی شکۆدار، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
سەرۆکی شورای دەوڵەت



DH.MKT.01212.00079.002

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>01212.00079</td><td>19 شەوال 1325</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی<br>باش کاتیبی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك سەید عەلی ئەفەندی داوای کردووە لە ناو ویلایەتی موسڵ لە قائیمقامیەتی قەزایەك هەڵبژێردرێت، لەلایەن جەنابی پەیوەندیداری خەلافەتیش فەرمانی پاشا دەرچووە، بەم راگەیەندراوە بۆ بریار و فەرمانی هومایۆنی شاهانەش لە نووسراوی مێژووی ١ تشرینی دووەم ١٣٢٣ ژمارە ٢٣١٥ داوای نووسراوی سەدری ئەعزەم کراوە، سەبارەت بە سەید عەلی ئەفەندی، قائیمقامێکی ناو ویلایەتی ناوهاتوو محەمەد شوکری ئەفەندی مردووە و شوێنەکەی بەتاڵە، بۆیە لە پلەی سێیەم لە قائیمقامیەتی قەزای رانیە دامەزرێت، بۆ ئەمەش رای جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت پێویستە.</td></tr>
</table>



| DH.MKT | 02701.00039 | 14 زیلحیجە 1325 |
|---|---|---|

بۆ سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان، لایەنی عالی
سـاڵح پاشـا لەگـەڵ حاجـی عەلـی ئەفەنـدی بـۆ ئەنجوومەنـی نێردراوانـی سـانجەقی کەرکـووك هەڵبژێـردراون، لـە موسـڵەوە جولـە دەکـەن، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە دەرچـووە، هاوپێـچ بـۆ عالـی نێـردراوە.



DH.MKT.02623.00036.001

| DH.MKT | 02623.00036 | 29 شەعبان 1326 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
هاوپێچی تەلەگرافنامەکەی تـرە، هـەر لـە کۆنـەوە چەتەکانـی هەمەوەنـد لـە سـانجەکانی کەرکـووك و سـلێمانی ئاسـایش تێـك دەدەن و ئـاژاوە دەنێنـەوە، دوێنـێ لـە کاتـی چاودێـری کردنیـان کـوردە بـۆرە دەشـتەچی تورشـی زادە لەگـەڵ مەفرەزەیەکـی ٤٠ کەسـی رووبـەرووی یەکـتر بوونەتـەوە، لـە کاتـی رووبەرووبوونەوەکـە لـە یوزباشـیەکانی ژاندارمـەی کەرکـووك حاجـی یوسـف ئاغـا لەگـەڵ نەفەرێـك لـە سـەربازی شـاهانە شـەهید بـوون، هەروەهـا نەفەرێکـی تـری ژاندارمـە بریـندار بـووە، لـە چەتەکانیـش دوو پیـاو کـوژراوە، ئـەم زانیاریـە لـە موتەسـەرفی سـلێمانی راگەیەنـدراوە، بـۆ ئـەوەی کۆتایـی بـە کردەوەکانـی هەمەوەنـدەکان بهێنرێـت، لەگـەڵ تـۆپ هێزێکـی تێکـەڵاو بنێردرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش هەواڵـی بەپەلـە بدرێتـە قوماندانـی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن، لەگـەڵ یەکـەم راگەیاندنیـش تابـووری ئێسـتر سـوارەی کەرکـووك میللـی ئیبراهیـم ئەرکـی پـێ دراوە چاودێریـان بـکات، تکایـە چاوێکـی پـێ بخشـێنرێتەوە.
والی موسڵ فەریق زەکی



| 25 سەفەر 1326 | 02770.00078 | **DH.MKT** |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>لەبەر گرنگی و ستراتیژیەتی شوێنی سانجەقی کەرکووك لەگەڵ داهاتە زۆرەکەی پێویست دەکات وەکو ویلایەتێك مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و لە رووی کارگێریەوە جیا بێتەوە، بۆیە لە زۆر شوێن بە مۆری زۆرەوە پێشکەشی سەدارەت دەکەن و داوا دەکەن کارگێریەکەی سەربەخۆ بێت، ئەم داواکاریانە بۆ والا نێردراوە، بە تێروانین لە هاوپێچەکانەوە خوێندنەوەی بۆ بکرێت و رەوان بکرێتەوە. | | |



| 21 زیلقەعدە 1326 | 003456.259166 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـۆ موتەسـەرفی سـانجەقی قـەزان موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك مەحمـود بـەگ دابمەزرێـت، بـۆ ئەمـەش ئامـاژەی دەوڵـەت لـە مێـژووی ١٩ زیلقەعـدە ١٣٢٦ پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی. | | |



BEO.003516.263667.001

| BEO | 003516.263667 | 19 رەبیعی کۆتایی 1326 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پاشای والی موسڵ

بەهـۆی ئـەم دەستپێشـخەریەی کـە لەلایـەن والـی موسـڵەوە لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی کـراوە، داوا دەکرێـت ئەنجامەکـەی بـە واڵا و زانیـاری پەرشـوبڵاو بدرێتـە بابـی عالـی، هەروەهـا ئـەم تاوانانـەی کـە کـراوە لەلایـەن چـوار کەسـەوە بـووە، لـە بارەیانـەوە مامەڵـەی پێویسـت ئەنجـام بدرێـت.



DH.MUİ..00001.1.00084.002

| DH.MUİ | 00001.1.00084 | 13 شەعبان 1327 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی
سەرۆك و ئەندامانی ئەم دیوانیە جەنگیەی کە بریار دراوە لە بازیان دابمەزرێت، ئەگەر بۆ خزمەت بانگ کراون، کەچی مەرکەزی بازیان کە چەمچەماڵە، لە گوندێکی بچووك پێك دێت، تا ئێستا لەگەڵ هەمەوەندەکان ٥٠ تاوانبار دەستگیر کراوە و بۆ پاراستنی ئەمانە لە گوندی ناوبراو گرتووخانە و قشلەیەك بۆ سەربازان بوونی نییە، سەبارەت بە دیوانی جەنگی ناوهاتوو ئەگەر لە بازیان بەجێ دەهێڵدرێت، هیچ کەسێك لە هیچ شتێك ئاگادار نەبێت، دەستەی دیوانی جەنگی یا بۆ مەرکەزی سانجەقی سلێمانی یا بۆ مەرکەزی سانجەقی کەرکوك بگوازرێتەوە، هەروەها تاوانبارانی دەستبەسەرکراویش بهێنرێنە ئەوێ و لەوێ بمێننەوە، والی موسڵ جەنابی پاشا کە لە کەرکووکە لە تەلەگرافنامەکەی رایگەیاندووە، نووسراوی بۆ کرا.



| 29 زیلقەعدە 1327 | 01478.000087 | I.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٣٣١٢
بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە

لە ناو ویلایەتی موسڵ، عەبدولستار ئەفەندی قائیمقامی قەزای کۆی سانجەقە، بە مۆڵەت چۆتە دەرسەعادەت، لەگەڵ ئەوەی ماوەی مۆڵەتەکەی تەواو بووە، بەڵام نەگەراوەتەوە سەر کارەکەی، بۆیە دوور بخرێتەوە و لە شوێن ئەو حاجی حەسەن ئەفەندی دابمەزرێت، کە بەرێوەبەری تۆماری پێشووی سانجەقی کەرکووك بووە، بە وەکالەت لە قائیمقامیەتی قەزای ناوهاتوو بووە و لەسەر ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو و بریاری ئەنجوومەنی هەڵبژاردن جێگیر بکرێت، جێبەجێ کردنی بە هاوکاری سەدارەتەوە دەبێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
راوێژکار بە ناوی نازری ناوەخۆ



| 6 سەفەر 1327 | 02752.00085 | DH.MKT |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکانی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٩٣
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆداری، لایەنی عالی
بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەی بەنگەدر ئیبراهیم ئەدهەم ئەفەندی ساڵی ١٣٠٣ تشرینی یەکەم لە بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی بەرواری بە کراوەیی دامەزرا، ئاماژەی پێ کراوە ئاخۆ لە سندوق ٢١٦ قوروش و نیو، واتە نیوەی مووچەی دەست بەسەر کراوە یاخود دەست بەسەر نەکراوە، ئەگەر دەست بەسەر نەکراوە ئەوا بە نووسراوی ١١ ئۆغستۆس ١٣٢٠ ژمارە ٦٩ لە ژمێریاری کەرکووك و ناحیەی ئینەجەی ناموسڵمانی سەر بە قەزای ئاینە گول لە زابیتەی مولکیە دامەزراوە، ئەم نیوە مووچەیەی کە بە دوایدا دەگەڕێت ئاخۆ دەست بەسەر کراوە یاخود دەست بەسەر نەکراوە لە نووسراوی مێژووی ١٣ کانوونی یەکەم ١٣٢١ ئاماژە بۆ سانجەقی ئەرتوغرول نێردراوە، لەگەڵ ئەوەی ووردبینی بۆ کراوە و روون بۆتەوە، کەچی تا ئێستا وەڵام نەهاتووە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە بە پەلە وەڵام بگەڕێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە بە تەلەگراف بە موتەسەرف راگەیەندراوە، هەروەها راگەیەندراوی پەیوەندیدارانی نەزارەتی سەدارەت لە ژمێریاری باس کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری سندوقەکانی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە



DH.MKT.02823.00092.001



DH.MKT.02823.00092.001

| DH.MKT | 02823.00092 | 1 جەمادی یەکەم 1327 |
|---|---|---|

بۆ نێردراوی بەغداد ئیسماعیل حەقی بەگ و ئەفەندییەکانی ساسون

ئەوانەی لە سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووک سەربەخۆ جموجۆڵ دەکەن، ئاسایشی کاری گواستنەوەی پارەوپول و کەلوپەلی بازرگانی پچراندووە، ئێمە سەرەتا بازرگانیمان لەگەڵ سلێمانی بووە، لە ترسی هێرشی چەتەکان کەلوپەل نانێرین، ئەم حاڵە هەم بۆ خەزینەی دەوڵەت هەم بە گشتی زیانی بە بازرگانانی بەغداد گەیاندووە، ئەمنیەتی ناوچەکە لەسەر پیشەی بازرگانی وەستاوە، تاوەکو ئەم حاڵەتە کار نەکاتە سەر دەوڵەت و کارێکی چاوەڕێ نەکراو و زیان روو نەدات، تکا دەکرێت ئاسایشی سانجەقەکان بەرقەرار بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە فەرمان.

بازرگان خضری زادە یاسین، بازرگان ئیلیا عەبدولعەزیز، بازرگان مومتاززادە عەلی، بازرگان شاول خاخام حەقیل، بازرگان سەید قاسم، بازرگان عەبدولرەزاق سەفار، بازرگان شاول شەنتوب، بازرگان مستەفا چادر، بازرگان سەید جەواد، بازرگان جەعفەر جەواد عەبدولرەزاق، بازرگان سەلمان حاجی داود، بازرگان غورە ساسون، بازرگان محیەددین، بازرگان بەسم ئەلبەشاعی، بازرگان ئیبراهیم حەفیل، بازرگان یەحیا، بازرگان ئیسحاق غورە، بازرگان شاول ساڵح ئەلباهو، بازرگان داود شەنتوب، بازرگان حەفیل شەماس، بازرگان روبیل یەعقوب شوحیت، بازرگان مەنشی، بازرگان یوسف جبرائیل عەباجی، بازرگان حەفیل یەهودا، بازرگان ئەسمان روبیل.



| 3 جەمادی یەکەم 1327 | 02832.00020 | DH.MKT |
| --- | --- | --- |

ئەنجوومەنی نێردراوان
سەرۆکایەتی
ژمارە ١٠٩٤
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بەهـۆی تێکچوونـی سـانجەقەکانی سـلێمانی و کەرکـووك هـاوردە کردنـی کەلوپـەل وەسـتاوە و ئەمنیەتـی بازرگانـی کێشـەی تێکەوتـووە، ئـەم بارودۆخـە هـەم زیانـی بـە خۆیـان و هـەم زیانـی بـە خەزینـە گەیانـدووە، بـۆ گەڕانـەوەی ئاسایشـی سـانجەقەکان لەلایـەن بازرگانەکانـی بەغـداد تەلەگرافنامـە بـە جۆرەهـا واژوو نێـردراوە، نەزارەتـی شـکۆدار ئـاگادار کراوەتـەوە و لـە ئەنجوومـەن بریـار دراوە، تەلەگرافنامەکـە ڕەوان دەکرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
سەرۆکی ئەنجوومەنی نێردراوان




DH.MKT.02843.00061.001

| DH.MKT | 02843.00061 | 23 جەمادی یەکەم 1327 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لــە ٢٣ و ٢٧ مایــس ١٣٢٥، ئــەم بریــارەی کــە لــە کۆپییەیەکــی تەلەگرافەکــە هاتــووە، بەنــدە خوێندنــەوەی بــۆ کــرد، لەهولحەمــد لــە هــەر لایەکــی ویلایــەت ئەمــن و ئاسـایش بەرقــەرار بــووە، لــەم دەورووبــەرە تەنیا هــەر لــە کۆنــەوە هەمەوەنــدەکان لــە ســانجەقەکانی کەرکــووك و ســلێمانی خەریکــی چەتەییــن، لــە نــاو ئــەم ســانجەقانە ئەوانــەی هاتووچــۆ دەکــەن ڕێگایــان دەگــرن، بــۆ نەهێشــتنی ئــەم کارەش هێــزی زابیتــە ئــەم توانایــەی نییــە ڕووبــەڕووی ئەمانــە بێتــەوە، بۆیــە داوای ســەرباز لــە لەشــکری شەشــەمی هومایــۆن کــراوە، لــەم وەڵامــەی هاتــووە دەرکەوتــووە بــەم نزیکانــە هەمەوەنــدەکان دوور دەخرێنــەوە و ڕووبەڕوویــان دەبنــەوە، ئاســایش بەرقــەرار دەبێــت، تــا ئــەم هێــزەش دەگاتــە ناوچەکــە ئــەوا بــە هەمــوو شــێوەیەك ئامــادەکاری بکرێــت و ڕێگــە نەدرێــت ســەرپێچی بکــەن، بــۆ ئەمــەش ئــاگاداری دراوەتــە موتەســەرفەکانی ناوهاتــوو، بــۆ پەلــە کــردن فەرمــان بدرێتــە نەزارەتــی جەنگــی شــکۆدار و قوماندانــی لەشــکری هومایــۆن.
ڕەشید والی موسڵ




BEO.003527.264525.002

| BEO | 003527.264525 | 3 رەبیعی یەکەم 1327 |
|---|---|---|

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان
ژمارە ٢٣٤
بۆ پایەی پاشای پەیوەندیداری سەدارەت
پێشەکی بە مەرکەزی ویلایەت هەژمار کراوە، لە کۆتاییدا گۆڕاوە بە مەرکەزی لیوا، کەرکووك بەهۆی گرنگی شوێن و گەورەییەوە دەکرێ بکرێتە ویلایەت، هەروەها لەگەڵ دانیشتوانی موسڵ رقیان لە یەکتر دەبێتەوە، بۆیە سانجەقەکە لە موسڵ جیابکرێتەوە و کارگێریەکەی ببێتە ویلایەت، بۆ ئەم داواکاریەش بە ناوی گشت دانیشتوانی لیواکە مۆرێکی زۆر کۆکراوەتەوە و داواکاری هاتووە، ئاگاداری دراوەتە لایەنی پەیوەندیداری نەزارەت و لە ئەنجوومەنی داواکاریش بریار دراوە، داواکاریەکانیش رەوان دەکرێتەوە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە و راگەیاندنی ئەنجامەکەی، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
سەرۆکی ئەنجوومەنی نێردراوان



| 12 رەبیعی یەکەم 1327 | 003529.264659 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی عالی
نـووسراوی عالـی لـە مێـژووی ١٩ مـارت ١٣٢٥ ژمـارە ٢٦ ئامـاژەی پێـکـرا، فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی تەرابلـس شـام محەمـەد عەلـی ئەفەنـدی دوورخراوەتـەوە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکـووک ئەسـعەد ئەفەنـدی دامەزرێـت، لەبـەر گونجـاوی هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 3 جەمادی کۆتایی 1327 | 003582.268619 | **BEO** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار، لایەنی عالی
بە پشت بەستن بە بریارنامەی تایبەت خانەنشین کردنی موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك عەبدولرەحمان پاشا بە بریاری شورای دەوڵەت دوای مۆڵەت بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا رەزامەندی لەسەر دراوە.




BEO.003605.270357.002

| BEO | 003605.270357 | 5 رەجەب 1327 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی کاروباری ناوەخۆ
قۆمیسیۆنی تۆماری زانیاری فەرمانبەران
ژمارە ١٧٩٦
بۆ پەیوەندیداری سەدارەت، لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندەمان

وەڵامی نووسراوی سەرەتای رەجەب ١٣٢٧ ژمارە ١٥٤٣ی سەدری ئەعزەم، بە پێویست زانراوە موتەسەرفی پێشووی کەرکووک عەونەڵڵا ئەلکازمی بەگ بگەڕێتەوە سەر ئەرکەکەی، لە دیوانی جەنگی عورفی بە گومانەوە هێنراوەتەوە، بەڵام بە بریاری ئەنجوومەنی وەکیلەکان بە هێشتنەوەی لە هێزی چاودێری میری ئاڵای مەزهەر بەگ لە موتەسەرفیەتی لیوای ناوهاتوو دامەزراوە، هەروەها دەستی بە ئەرکەکەشی کردووە، بۆیە عەونەڵڵا ئەلکازمی بەگ بگەڕێتەوە سەر ئەرکەکەی پێشووی یاخود لە بارەی مەزهەر بەگ بە رای پەیوەندیداری سەدارەت ئەنجامێك وەربگیرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری ناوەخۆ

| 25 رەبیعی یەکەم 1328 | 00052.00025 | DH.MB.HPS.M |
|---|---|---|
| مووچەی فەرمانبەرانی گرتووخانەی ویلایەت و قەزاکان | | |

| دەرماڵەی ساڵانە | دەرماڵەی مانگانە | | | | ژمارە | روون کردنەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | دەبێتە | | تاك | | | |
| | پارە | قوروش | پارە | قوروش | | |
| بەڕێوەبەر | 1 | 100 | | 300 | 1 | سانجەقی سلێمانی بەڕێوەبەری گرتووخانە |
| کاتیب | 1 | 400 | | 200 | 1 | سانجەقی سلێمانی کاتیبی گرتووخانە |
| سەرگاردیان | 1 | 400 | | | | سانجەقی سلێمانی گاریانی گرتووخانە |
| گاردیان | 5 | 300 | 20 | 117 | 8 | سانجەقی سلێمانی گاردیانی گرتووخانە |
| گاردیانی ئافرەت | 1 | 200 | | 76 | 1 | سانجەقی سلێمانی گاردیانی ئافرەت |
| بەڕێوەبەر | 1 | 600 | | 300 | 1 | سانجەقی کەرکوك بەڕێوەبەری گرتووخانە |
| کاتیب | 1 | 400 | | | | سانجەقی کەرکوك کاتیبی گرتووخانە |
| سەر گاردیان | 1 | 400 | | 200 | 1 | سانجەقی کەرکوك سەرگاردیانی گرتووخانە |
| گاردیان | 5 | 300 | | 150 | 7 | سانجەقی کەرکوك گاردیانی گرتووخانە |
| گاردیانی ئافرەت | 1 | 200 | | 76 | 1 | سانجەقی کەرکوك گاردیانی ئافرەتی گرتووخانە |
| | | 300 | | 150 | 1 | قەزای هەولێر فەرمانبەری گرتووخانە |
| | | 300 | | 150 | 1 | قەزای رواندز فەرمانبەری گرتووخانە |
| | | 300 | | 150 | 1 | قەزای سەلاحیە فەرمانبەری گرتووخانە |
| | | 300 | | 150 | 1 | قەزای کۆی سانجەق فەرمانبەری گرتووخانە |
| | | 300 | | 150 | 1 | قەزای رانیە فەرمانبەری گرتووخانە |




İ.ML.00087.00009.004

| İ.ML | 00087.00009 | 3 شەعبان 1328 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی ئەنجوومەنی داواکاری بریکارەکان
٢٢٢٧
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
ئـەم کاتـەی دەرویـش کـە فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی مونتەفیـك بـووە بـە گونجـاو زانـراوە ئەرکـی دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکووکـی پـێ بدرێـت، هەروەهـا بـۆ ئەرکـی دەفتەرخاقانـی مونتەفیـك بـاش کاتیبـی دەفتەرخاقانـی موسـڵ سـەید عەلـی ئەفەنـدی دەسـت بـە کار بـوون، بـۆ ئەمـەش نـووسراوی نەزارەتـی دەفتەرخاقانـی عالـی بـە هاوپێچـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت.
سەدری ئەعزەم


OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
81 | 30 | 2

ŞD.00081.00030.002

| ŞD | 00081.00030 | 19 زیلقەعدە 1329 |
|---|---|---|

نەزارەتی دەفتەرخاقانی
قەڵەمی تەحریر
ژمارە ٢٧٤
راگەیەندراوی داعیە
لــە نــاو ســانجەقی کەرکــووك بــە نــاوی ســویجە بــە تەخمینــی ٤ هــەزار کیلۆمەتــر و ئــەم زەوییانــەی کــە لــە چواردەوریشــی هەیــە رووەکێکــی بــە پیتــی هەیــە، لەگــەڵ ئــەوەی جۆلانگاهــی ســورانەوەی چەنــد عەشــیرەتێکی خولاوەیــە، حاڵــی حــازر بــارودۆخ هــاوکار نییــە بــۆ ئــەوەی ئەمانــە لــەم زەوییانــە نیشــتەجێ بکرێــن، بــەڵام ســاڵی ١٣٢٦ مــاددەی ٢٦ی یاســای بوودجــە بــە شــێوەی قیســت بدرێتــە ئــەم جوتیارانــەی کــە دەیانەوێــت لەســەری کشــتوکاڵ بکــەن، لــە ١٠٠ دۆنــم تــا ١٠٠٠ دۆنــم زەوی رێــك بخرێــت، هــەم بــۆ نۆژەنکردنــەوەی زەوییەکــە هــەم بــۆ دانیشــتوانی جوتیــار پێداویســتی ئامــادە بکرێــت و ئــارەزووی نیشــتەجێ کــردن لــەلای ئــەم عەشــیرەتە کۆچەریانــە دروســت بکرێــت، بەمــەش ئاســانکاری لــە نیشــتەجێ کردنیــان دەکات، بــۆ ئەمــەش لــە ویلایەتــی موســڵ وێنــەی نــووسراوی ئەنجوومەنــی گشــتی لــە ویلایەتــی ناوهاتــوو نێــردراوە، لــە مەزبەتــەی ٢٥ تەممــوز ١٣٢٧ راگەیەنــدراوە، هەروەهــا وێنــەی رەزامەنــدی رەوان بکرێــت، کارەکــە جێبەجــێ دەکرێــت، ئامــاژە و راگەیەنــدراوی پەیوەندیــداری ســەدارەت جەنابــی پاشــا حەواڵــە کــراوە، لەگــەڵ ووتــەی نــەزارەت لــەم بابەتــەدا بریــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەم کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.
نازری دەفتەرخاقانی داعی محەمەد

BEO.003859.289424.001

| BEO | 003859.289424 | 20 سەفەر 1329 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی عالیە
عەبدولوەهاب ئەفەندی لەم کاتەی کە فەرمانبەری دەفتەرخاقانی بووە، بە بەرزکردنەوە لە دەفتەرخاقانی عەمارە دامەزراوە، بەڵام لەسەر داواکردنی خۆی داوای کردووە لە ئەرکەکەی پێشووی بهێڵدرێتەوە، بۆیە لە شوێن ئەو کە نوری ئەفەندی کاتیبی تاپۆی مەرکەزی کەرکووك دامەزراوە، بچێتە عەمارە لەم بارەیەوە لە مێژووی ٢٠ کانوونی دووەم ١٣٢٦ بە فەرمانی پاشای جەنابی پاشا وێنەی پەسەندکراوی هاوپێچ دەنێردرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




DH.MB.HPS.00144.00106.001

<table>
<tr><th>28 ڕەبیعی یەكەم 1330</th><th>00144.00106</th><th>DH.MB.HPS</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>ژمێریاری ویلایەت<br>٥٠٦١<br>بۆ بەڕێوەبەرایەتی فەرمانگەی گرتووخانە<br>سانجەقی كەركووك كە سەر بە ویلایەتی موسڵە، بە گوێرەی ژمارەی زیندانیانی گرتووخانەی سانجەقی كەركووك ئەم ژمارە گاردیانەی كە لەوێ ئەركەكەیان جێبەجێ دەكەن، ژمارەیان ٨ نەفەرە، یەك نەفەری تریش ڕەوان بكرێت و دابمەزرێت، واتە لە گرتووخانەكانی قەزا ئەركەكەی بگوازرێتەوە، هەروەها مووچەی ئەم ٨ نەفەرە لە مارتی ١٣٢٨، هەر یەكە بۆ ١٥٠ قوروش بەرز بكرێتەوە، هەروەها لە قەزایەكانیش دووبارە ٤ نەفەر گاردیان دادەمەزرێت، بۆ جێبەجێ كردنی لە مێژووی ٤ مارت ١٣٢٨ ویلایەت ئاگاداری دراوە، ئەم زانیاریانە بەرز كراوەتەوە.</td></tr>
</table>

DH.İD.00145.2.00007.002

| 19 شەوال 1330 | 00145.2.00007 | DH.ID |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
لــە موســڵ تــا کەرکــووك دوو هێڵــی تەلەگــراف بوونــی هەیــە، یەکێکیــان تایبەتــە بــە پەیوەنــدی بەغــداد و دیاربەکــر کــە تەلــی راســتەقینەیە، هەرچــی تەلەکــەی تــرە ئــەوا ویلایەتــی موســڵ لەگــەڵ لەشــکری قولــی لیواکانــی کەرکــووك و ســلێمانی هەروەهــا لــە نێــوان قەزاکانــی هەولێــر و روانــدز و کــۆی ســانجەق و مەعمــورەی حەمیدیــە بــەکار دەهێنرێــت، کــە تەلەگرافەکانــی ناتوانــن هەواڵگــری ســنوور بگوازنــەوە، بۆیــە هەواڵــە گرنگــەکان چەندیــن رۆژ دوا دەکەوێــت، هەولێــر و کەرکــووك ٢٠ کاتژمێــر دووری نێوانیانــە، بۆیــە زیادکردنــی تێلــی ســێیەم پێویســتە، لــەم کاتــەدا نۆژەنکردنــەوەی هێڵــەکان دەســت پــێ دەکات، لەگــەڵ خەرجــی ئــەو نۆژەنکردنەوانــە تێلــی ســێیەمیش زیــاد بکرێــت، بەمــەش هــۆکاری دواکەوتنــی هەواڵــە گرنگەکانــی ســەر ســنوور چارەســەر دەبێــت، بــۆ بەرژەوەنــدی هەمــوو لایــەك تــکا دەکرێــت.
تاهیر والی

DH.MUİ.00152.00098.001

| DH.MUİ | 00152.00098 | 5 سەفەر 1330 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ

لــە ٤ کانوونــی دووەم ١٣٢٧ لــە ســانجەقی کەرکــووك تەحســیلداران گشــتیان رادەســت کــردووە، جگــە لــە ٨٥ تفەنــگ نەبێــت، ئەویــش بــە پێویســت زانــراوە، بۆیــە وەڵامــی کەرکــووك رادەگەیەندرێــت.

تاهیر والی


MV.00171

| MV | 00171.00018 | 7 زيلحيجه 1330 |
|---|---|---|

کورتەی بابەت

بـۆ ئـەوەی بەشـداری شـەری ئێسـتا بکـەن، ئـەو پیـادە و سـوارەیەی کـە لـە نـاو لیـوا بوونـی هەیـە، نزیکـەی ٣٠ هـەزار نەفـەرە، هەمـووی بـۆ جولەکـردن ئامادەیـە، لەلایـەن دەسـتەی کارگێـری ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقی کەرکـووك تەلەگرافنامـە نێـردراوە و خوێندنـەوەی بـۆ کـرا.

بریار

لـە دانیشـتوانی لیـوای ناوهاتـوو ئـەوەی نیشـانی داوە شـایەنی رێزگرتنـە، بـەڵام لەبـەر دووری شـوێنەکە بـۆ ئامادەبـوون لـە شـوێنی جەنـگ جێگـەی سـەرنج راکێشـانە، هەروەهـا سـەربازانی عوسـمانیە بـە دوورخسـتنەوەی دوژمـن سـەرقاڵە و بـەم نزیکانـە لەشـکری هومایۆن سـەرکەوتن بەدەسـت دەهێنێـت، حاڵـی حـازر بـۆ پاراسـتنی ئاسایشـی ناوچەکـە ئاگاداری موتەسـەرفی لیـوای ناوهاتـوو و ئامـاژەی نەزارەتـی ناوەخۆی شـکۆدار نـووسراوی پێکرا.




| BEO | 004041.303060 | 3 جەمادی کۆتایی 1330 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>فەرمانبــەری دەفتەرخاقانــی ســانجەقی ئاماســیا عەلــی رزا ئەفەنــدی بــۆ کەرکــووک و فەرمانبــەری دەفتەرخاقانــی کەرکــووک دەرویــش ئەفەنــدی بــۆ تەرابلــس شــام و فەرمانبــەری تەرابلــوس شــام عەلــی رزا ئەفەنــدی بــۆ ئەرتوغــرول و فەرمانبــەری ئەرتوغــرول زیــوەر ئەفەنــدی بــۆ دەفتەرخاقانــی ســانجەقی ئاماســیا بگوازرێنــەوە و دابمەزرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراوی مێـژووی ١ مایـس ١٣٢٨ ژمـارە ٦٧ رێکخـراوە و لیسـتی فەرمانـی پاشـا لەگـەڵ واژووی جەنابـی پاشـای هومایـۆن رەزامەنـدی دەربریـوە و هاوپێـچ وێنەیەکـی نێـردراوە هیممـەت بکرێـت. | | |


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO

BEO.004057.304203.001

| 14 ڕەجەب 1330 | 004057.304203 | **BEO** |
|---|---|---|

بۆ وەکالەتی نەزارەتی دارایی شکۆدار
فەتحوڵڵا ئەفەندی لە ئەرکی دەفتەرخاقانی سانجەقی سلێمانی و راغب ئەفەندی لە ئەرکی قەرەحیسار و مونیر ئەفەندی لە ئەرکی ئورفە و عەلی رزا ئەفەندی لە ئەرکی ئیچ ئیل و ڕەفعەت ئەفەندی لە ئەرکی کەرکووك دامەزرێن، بۆ ئەمەش نووسراوی عالی لە مێژووی ٩ حوزەیران ١٣٢٨ ژمارە ٩٧ نووسراوەتەوە، لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا بە واژووی هومایۆنی جەنابی پاشا پەسەند کردنی فەرمووە، هاوپێچ هیممەت بکرێت لە ئەنجامدانی.




DH.MTV.00049.2.00041.002

| DH.MTV | 00049.2.00041 | 22 رەبیعی یەکەم 1331 |
|---|---|---|
| بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>قەڵەمی تەحریرات<br>وێنەی فەرمانی پاشایە<br>فەرمانبەری دەفتەرخاقانی سانجەقی کەرکوك رەفعەت ئەفەندی دراوەتە دادگا بە بڕیاری شورای دەوڵەت جێگیر کراوە.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نەزارەتی دارایی ئەرکی پێدراوە، لە ٢٢ رەبیعی یەکەم ١٣٣١، ١٦ شوبات ١٣٢٨.<br><br>نازری دارایی و مەحمود شەوکەت سەدری ئەعزەم | | |



| 7 زیلقەعدە 1331 | 00181.00009 | MV |
|---|---|---|

پوختەی کاغەزی تایبەتی ئەنجوومەنی بریکارەکانە
پوختەی بابەت
دوو پارچە نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆ خوێندرایەوە

بریار
لـە نـووسراوی ناوهاتـووان نووسراوەتـەوە، ئـەم سـاڵ هەناردەکردنـی زەخیـرە بـە شـێوەیەکی سەربەسـت دەبێتـە هـۆی دروسـت بوونـی کێشـە و تەنگانەیـی، سـاڵی رابـردووش قورغـکاری کـرا، ئـەم سـاڵیش هەمـان شـت روودەدات بۆیـە چاودێـری بکرێـن، پێداویسـتی ناوەخـۆ پـڕ بکرێتـەوە و هیـچ نەبێـت رێگـە نەدێـت لـە رێـگای رووبـارەوە ئەنجـام بدرێـت و قەدەغـە بکرێـت، ئەمـەش لـە ئەنجوومەنـی کارگێـڕی سـانجەقی کەرکـووك ئامـاژەی پێکـراوە، لـە بریـکاری ویلایەتـی موسـڵیش ئـاگاداری هاتـووە و بریـاری قەدەغـە کردنـی سـاڵی رابـردوو بـۆ ئەم سـاڵیش بـەردەوام بێـت و کاری پـێ بکرێـت، بـەم شـێوەیە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، لـە وەڵامدا نـووسراو بـۆ نەزارەتی ناوهاتـوو کراوە.


İ.DH 1499/71 /1331.Ş/14

İ.DH.01499

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01499.000071</td><td>8 شەعبان 1331</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>بەڕێوەبەرایەتی قەڵەمی فەرمانبەران<br>ژمارە ۱۰۱۵<br>فەرمانی پاشا<br>بە دوورخستنەوەی موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك عەونەڵلا کازمی بەگ، قائیمقامی پێشووی تاشون سلێمان سری بەگ لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو بە مووچەی پلەی دووەم دادەمەزرێت.<br><br>بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نەزارەتی ناوەخۆ ئەرکی پێدراوە، ٨ شەعبان ١٣٣١ و ٢٩ حوزەیران ١٣٢٩.<br>نازری ناوەخۆ/ سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
4195 314560

BEO.004195.314560.001

| 8 شەعبان 1331 | 004195.314560 | BEO |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بۆ موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك بە مووچەی پلەی دووەم، قائیمقامی پێشووی تاشوز سلێمان سری بەگ دامەزرێت بۆ ئەم مەبەستە لە مێژووی ٢٦ حوزەیران ١٣٢٩ ژمارە ٧١٠ ی نووسراوی عالی ڕێکخراوە لەگەڵ لیستی فەرمانی پاشا بە واژووی جەنابی پاشای هومایۆن پەسەند کراوە، وێنەی پەسەندکراوی بۆ عالی نێردراوە، هیممەت بکرێت. | | |




مابين همايون ملوكانه

باشكتابتى

١٢٤



2

İ.MBH.00016.00024.002

| 28 شەعبان 1332 | 00016.00024 | **İ.MBH** |
|---|---|---|

مابەینی هومایۆنی ملوکانە
باش کیتابەت
١٣٤

لەسەر هەندێك داواکاری و گازاندەوە دانیشتوانی سانجەقی کەرکووك بە واژوو و مۆری جیاواز داواکاریان پێشکەشی عەتەبەی پاشای ملوکانە کردووە، جگە لەمە خاوەنی مەولودخانەی قەرەحیسار پۆست نشینەکەی محەمەد بەهائەددین و تەمەل بن مستەفا بە مۆر و واژووی خۆیان داواکاریان پێشکەش کردووە، هاوپێچ لەگەڵ تەلەگرافنامەی بە واژووی عەلی بابا هەروەها رفاعی زادە عەلی و هاوەڵانی و لە گرتووخانەی ئەنقەرە دەستبەسەرکراو حەسەن کوڕی کەتهودا و سەرۆکی شارە مادیا و بەرێوەبەری وەقفی ئەبو مەدەت ئەلبەشیر و بە ناوی دەست بەسەرکراوی گرتووخانەی قۆنیا حاجی مەحمود و هاوەڵانی و کەندەرلی زادە و هاوەڵانی و لە ئەسکەلە مستەفا و سەید عەبدوڵلا و هاوەڵانی ٩ پارچە تەلەگرافنامەی بە واژووی ناوبراوان نێردراوەتە پەیوەندیدارانی سەدارەت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
جەنابی سەرکاتیب

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف اداره‌سی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN

DH.ŞFR.00440.00037.001

| 18 شەوال 1332 | 00440.00037 | **DH.ŞFR** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

دوو سێ مانگ دەبێت بەرێوەبەرایەتی سانجەقی کەرکووك بێ بەرێوەبەرە، ناکرێت لەمە زیاتر بێ خاوەن بمێنێتەوە، بۆیە ئەمرۆ عەبدولنەبی ئەفەندی قەڵەمی تەحریراتی مومەییزی پێشووی بەسرا کە ئێستا لە دەرسەعادەتە، هەموو سیفەتەکانی بەرێوەبەرایەتی تێدا بەدی دەکرێت، فەرمان دەربچێت لە بەرێوەبەرایەتی ناوبراو دابمەزرێت.

سلێمان نەزیف والی موسڵ



ML.EEM.01069.00011.008

| ML.EEM | 01069.00011 | 12 جەمادی یەکەم 1332 |
|---|---|---|

لە بارەی نیوەی خان و کۆشکێکی یەك دەرگای سانجەقی کەرکووك
لەسەر ئاماژەی نووسراوی ١٩ تشرینی دووەم ١٣٢٩ ژمارە ٧٧/٤٧١٤ کە ئاماژەی پێکراوە، لە سانجەقی کەرکووك سنوورەکەی دیارە کۆشکێکی یەك دەرگا بە ٣٠ هەزار قوروش و ئەم خانەی کە بە خانی حاجی شەعبان ناودەهێنرێت هەر نیوەی بە ٢٧ هەزار قوروش لە دەفتەر تۆمار کراوە، بەڵام بینایەکانی ناوهاتوو لە نووسراوی باجدا هەر یەکە بە ١٢ هەزار قوروش تۆمار کراوە، ئەگەر بەم برەیە فرۆشرابێت، ئەوا ئەمرۆ لە خەزینە بە ئاماژەی پێشوو سەنەدی خاقانی ڕێك بخرێت و لەگەڵ دەفتەری ئەملاکی میری بنێردرێت.


باب عالى
داخليه نظارتى
عدد ١١٤٨
ارادهٔ سنيه
كركوك سنجغى متصرفلغنه اوچنجى صنف معاشيله ملكيه مفتشلرندن عبدالقادر افندى تعيين ايدلمشدر
اشبو ارادهٔ سنيه نك اجراسنه داخليه ناظرى مأموردر ١٤ شعبان ١٣٣٢ و ٢٥ حزيران ١٣٣٠
داخليه ناظرى
صدر اعظم
i.DH 1509/1332.Ş/23
22
2
İ.DH.01509

| 14 شەعبان 1332 | 01509.000022 | İ.DH |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران
ژمارە ١١٤٨
فەرمانی پاشا
بۆ موتەسەرفیەتی سانجەقی کەرکوك بە مووچەی پلەی سێیەم عەبدولقادر ئەفەندی بە پشکنینی مولکیە دامەزراوە.

بــۆ جێبەجــێ کردنــی ئــەم کارە نــازری ناوەخــۆ ئەرکــی پێــدراوە، ١٤ شــەعبان ١٣٣٢، ٢٥ حوزەیــران ١٣٣٠.
نازری ناوەخۆ/ سەدری ئەعزەم

DH.İ.UM.EK.00006.00079.001

| DH.I.UM.EK | 00006.00079 | 17 ڕەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە ٩ی شوبات تا ١٥ لە کۆپری ٨٢٥٩ قیە گەنم و ٥٢ قات جێگەی نووستن پەیوەستە بە کەرکووکەوە لە کۆی سانجەقیش ٨ تەنەکە قاورمە، لە بەغدادیش ٢٧٩٢٣ قیە جۆ ڕەوانی سامەرا کراوە.<br>والی ڕەشید | | |

DH.MB.HPS.M.00019.00077.005

| DH.MB.HPS.M | 00019.00077 | 27 ڕەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆ<br>خشتەی ئاماری ١ مارت ١٣٣١ ی بەڕێوەبەرایەتی کارگێری بینایەکانی میری و گرتووخانەکان. | | |

| ناوی ویلایەت | | ئاژاوە | | | تاوان | | | دەستبەسەرکراوان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | مێ | دەبێتە | نێر | مێ | دەبێتە | نێر | مێ | دەبێتە |
| مەرکەز | ویلایەت | 38 | 1 | 39 | 208 | 1 | 209 | 92 | 1 | 93 |
| بازیان | قەزا | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 2 | | 2 |
| سلێمانی | سانجەق | 6 | | 6 | 78 | | 78 | 32 | | 32 |
| عەقرە | قەزا | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 2 | | 2 |
| کەرکووک | سانجەق | 10 | 1 | 11 | 54 | | 54 | 154 | | 154 |
| دهۆك | قەزا | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 6 | | 6 |
| مەعمورەتولحەمیدیە | قەزا | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 0 | 5 | | 5 |




AE.SAMD.III.00131.12844.001

| AE.SAMD.III | 00131.12844 | 11 رەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|

جەنابی بە بەزەیی و بە میهرەبانی سوڵتانم

لـە ناحیـە و سـانجەقی کەرکـووك، مەزرەعەکانـی قـزل کـرك و حـەق حـەق بەڕێـوە دەبـەم، تیمارەکـە ٣ هـەزار ئاقچەیـە و بـۆ وەرگرتنـی پاکانـەی عالـی داواکاری دەسـتم بـۆ ئەسـتانە بـەرز کـردەوە، لـە کاتـی هاتنـی بەهـۆی دووری شـوێنەکە ئـەوەی هێناویەتـی سـێ پاکانـەی لـە ناوبـردووە، لەبـەر تۆمـاری کەنـار کـە کـراوە، تـکا دەکـەم دووبـارە پاکانەکـەم پـێ بدرێتـەوە، فەرمـان لـە سـوڵتانمانەوەیە.

بەندە حوسێن ئیبن کوشە




ML.EEM.01151.00007.003

| ML.EEM | 01151.00007 | 3 جەمادی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|

دەفتەرداری موسڵ
قەڵەمی ژمێریاری
١٤٧٥ گشتی
١٠٥ تایبەتی
بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار، لایەنی عالی
بـە ووتـەی بەڕێوەبەرایەتـی ئەملاکـی میـری قەڵەمـی دووەم، وەڵامـی فەرماننامـە لـە مێـژووی ٢٢ تەممـوز ١٣٣٠ ژمـارە ٣٠٠٣/٥٠ ی پەیوەندیـداری نەزارەتـی عالیـە، لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك زەوی بـای حەسـەن بـێ خـاوەن خراوەتـە موزایـدەوە، لـە ١٠٠٠ دۆنـم پێـك هاتـووە و لـە خـوار ١٦ هـەزار قوروشـە، هەروەهـا زەوی ناوهاتـوو لەگەڵ زەوی خاڵـی مەلحـە جیاوازە و هەردووکیـان بـە پارچـە سـنوور و دۆغمـی دیـاری بکرێـت و جیـا بکرێتـەوە، دووبـارە بخرێتـە موزایـدەوە، بـەم شـێوەیە زەوی خاڵـی بـای حەسـەن و مەلحە زیاتر لـە ٥٠ هەزار قـوروش دەکات، بـە ووتەی دەفتەرخاقانـی و ئەنجوومەنـی کارگێـری لیوا لە ژمێریـاری کەرکووك نـووسراوی ١٥ مارت ١٣٣١ ژمـارە ٣١٥/٧٥ هاتووە و ڕەزامەنـدی داوە، لەسـەر جێبەجـێ کردنـە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
دەفتەرداری موسڵ مۆری ئەحمەد بەسیم


باب عالى
داخليه نظارتى
مأمورين و سجل احوال مديريتى
عدد
٢٩٨٦

اراده سنيه

اشبو اراده سنيه نك اجراسنه داخليه ناظرى مأموردر

صدر اعظم
داخليه ناظرى

İ.DH 1512/1333.R/23
87

İ.DH.01512

| İ.DH | 01512.000087 | 22 ڕەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی فەرمانبەران و تۆماری ناسنامە
ژمارە ٢٩٨٦
فەرمانی پاشا

بۆ موتەسەرفی سانجەقی حەدیدە مستەفا نادر موتەسەرفی سانجەقی تفر و بۆ موتەسەرفی سانجەقی گوموشخانە بە مووچەی پلەی سێیەم عەبدولقادر بەگ کە لە موتەسەرفی کەرکووک جیابۆتەوە، بگوازرێنەوە و دابمەزرێن.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٢٢ ڕەبیعی کۆتایی ١٣٣٣ لە ٢٤ شوبات ١٣٣٠.

سەدری ئەعزەم/ نازری ناوەخۆ




BEO.004342.325630.001

| BEO | 004342.325630 | 23 ڕەبیعی کۆتایی 1333 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامــی نــووسراوی ٢٣ شــوبات ١٣٣٠ ژمــارە ١٦٩٩ ی عالیــە، مســتەفا نــادر موتەســەرفی ســانجەقی تفــر بــۆ موتەســەرفی ســانجەقی حەدیــدە و بــۆ موتەســەرفی ســانجەقی گوموشــخانەش بــە مووچــەی پلــە ســێ موتەســەرفی کەرکووکــی دوورخــراوە عەبدولقــادر بــەگ دامەزرێــن و دەســت بــە کار بــن، بــۆ ئــەم مەبەســتەش وێنــەی نــووسراوی فەرمانــی پاشــای جەنابــی پاشــای پەســەند کــراوی بــۆ دەوڵــەت نێــردراوە.



| 1333 زیلقەعدە 17 | 004376.328163 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی مێژووی ٩ ئەیلوول ١٣٣١ ژمارە ٦٢٤ی عالی: شاکر بەگ موتەسەرفی حەما دوورخراوەتەوە، لە شـوێن ئەو عەلی فەروزان موتەسـەرفی کەرکوك و بۆ موتەسـەرفی کەرکووك سـامی بەگ دوورخراوە لە موتەسەرفی تفر دامەزرێن، بۆ ئەم مەبەستە بە فەرمانی پاشا مۆڵەت دراوە و وێنەی پەسند کراوی هاوپێچ نێردراوە.

T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

BEO.004391.329303.001

| BEO | 004391.329303 | 24 سەفەر 1334 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار
وەڵامی نووسراوی ١٥ کانوونی یەکەمی ١٣٣١ ژمارە ١٧٤ ی عالییە: لەم ساڵەدا لە سەرەتای شوباتەوە دامەزراوەکان ڕێکخراوە و بۆ سەرۆکایەتی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك مستەفا شەوقی ئەفەندی سەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای ناوهاتوو دامەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە و مامەڵەی تری دادوەری ئاماژە لە دەوڵەتەوە هاتووە، فەرمانی پاشا دەرچووە و وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ لایەنی عالی نێردراوە.



| 1334 رەجەب 14 | 004414.331000 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ٣٠ نیسان ١٣٣٢ ژمارە ٢٠٥ ی عالییە: سامی بەگ موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك دوور خراوەتەوە، بۆ ئەم مەبەستە نووسراوی پاشای جەنابی پاشا رەزامەندی نیشان داوە و وێنەی پەسەند کراوی هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە. | | |



| 25 رەجەب 1334 | 004416.331130 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

وەڵامــی نــووسراوی مێــژووی ١١ مایــس ١٣٣٢ ژمــارە ٢٣٧ی عالییــە: بــۆ موتەســەرفی ســانجەقی کەرکـووک قائیمقامـی پێشـووی ساسـۆن سـەبری بـەگ دامەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش جەنابـی پاشــا بــە فەرمانــی پاشــا رەزامەنــدی داوە، وێنــەی پەســەندکراو هاوپێــچ بــۆ لایەنــی دەوڵــەت نێــردراوە.




DH.EUM.ECB.00008.00024.003

| DH.EUM.ECB | 00008.00024 | 29 ڕەبیعی کۆتایی 1335 |
|---|---|---|

بۆ بەڕێوەبەرایەتی عالی، هۆبەی پەنابەرانی ئەمنیەتی گشتی

بەڕێوەبەر بەگ ئەفەندی

لە بارەی پەنابەران لە دادگای سوڵحی سزای سانجەقی کەرکووك سەر بە ویلایەتی موسڵ بڕیارەکان یەکلاییکرەوەن، لەم ساڵە پەیوەستە بە مانگی کانوونی دووەم، ئەوراقەکان ڕێکخراوە و خشتەی داد هاوپێچ ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە.

قۆمیسیۆنی پۆلیسی کەرکووك


OSMANLI ARŞİVİ
DH.EUM. 6.Şb.
16 59

| DH.EUM.6.Şb. | 00016.00059 | 20 شەعبان 1335 |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>١٠٩ تایبەتی<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لە زیندانی هەولێر سێ دەستگیرکراو رایکردووە، یەکێکیان بە زیندووی و دووەکەی تریش بە کوژراوی دەستگیرکراوە، لە تەلەگرافنامەی موتەسەرفی کەرکووک راگەیەندراوە.<br>والی موسڵ | | |

DH.İ.UM.EK.00023.00074.001

| DH.I.UM.EK | 00023.00074 | 12 موحەررەم 1335 |
|---|---|---|
| هاوپێچ ٣ تشرینی یەکەم ١٣٣٢، ساڵی ١٣٣١ لە قەزای کەرکووک ٢٠٩١ و لە قەزای هەولێر ٢٣٥٩، لە رانیە ١٣٠٠، لە سەڵاحیە ١٠٧٨، سەر مەڕ خراوەتە ژێر دەست، لە قەزای رواندز بە کۆمەڵ دەفتەرەکانی سوتاوە، ناتوانرێت هەژمارەکەی بنێردرێت، لە قەزای کۆی سانجەقیش هێشتا وەڵام وەرنەگیراوە، لە قەزای سنجاریش سەر مەڕەکان نەکەوتوونەتە ژێر دەست. واحید والی | | |




| DH.EUM.2.Şb | 00043.00047 | 14 موحەررەم 1335 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
١٩٤ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بۆ جەنابی نازر بەگ
لە ناو سانجەقی سلێمانی لە گوندی کولمکوەی سەر بە قەزای بازیان، بۆ دەستگیرکردنی تاوانباری ئەو تاوانەی کە ئەنجام دراوە، لە تابورەکانی کەرکووك و سلێمانی بە تێکەڵی مەفرەزەیەك پێك هێنراوە و بۆ ئابڵوقەدانی گوندەکە رۆیشتوون، لە کاتی گەیشتن رووبەرووبوونەوە رووی داوە، شەڕەکەش حەوت کاتژمێر بەردەوام بووە، هەروەها یەك مایین و یەك ئێستری ژاندارمەکان بریندار بووە، جگە لەوە بۆ دوورخستنەوەی بوێری کەرانیش فەرمان دراوە هێزەکە زیاد بکرێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
حەیدەر والی موسڵ




DH.SN.THR.00080.00092.001

<table>
<tr><td>DH.SN.THR</td><td>00080.00092</td><td>23 شەوال 1336</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>١٣٤ تایبەت<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>مـۆری فەرمـی ناسـنامەی فەرمانبەرێتـی هەولێـر بەهـۆی مردنـی فەرمانبەرەکـەوە وون بـووە، بۆیـە لـە موتەسـەرفی کەرکـووک نـووسراوە، لەبـەر دواکەوتنـی مامەڵـەکان ئێسـتا لـە خۆچێیـی دروسـت کردنـی مۆرێـك جێبەجـێ بکرێـت، لـە کارگێـری گشـتی مـۆری فەرمـی جێبەجـێ بکرێـت و بنێردرێـت، راگەیەنـدراوە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>